# هۆکارەکانی زیادو کەمی باوەڕ

نوسینی

عبدالرزاق کوڕی عبدالمحسن البدر

وەرگێڕانی

زانا فاروق حمە رشید



نـــــاوی کتێـــــب	هۆکارەکانی زیادوکەمی باوەڕ

دانـــــــــــــــراوی	دکتۆر عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

وەرگێڕانـــــــــــــی	زانا فاروق حمە ڕەشید

پێداچـــــــــوونەوە	ئاکۆ جلیل کریم (( گۆخلانی ))

نـۆرەو سـالّی چـاپ	یەکەم ٢٠١٤ز

ژمارەی سپاردن	( ٢١٨١ )ی سالّی (٢٠١٣)ی پێدراوە.

# أسباب
# زيادة الإيمان ونقصانه

# هۆكارەكانی
# زیادو كەمی باوەڕ

نوسینی
عبدالرزاق كوڕی عبدالمحسن البدر
وەرگێڕانی
زانا فاروق حمه رشيد

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس بۆ خوای گەورە و میهرەبان کە مۆڵەت و دەرفەتی دام بۆ وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە بە نرخە ﴿ أسبابُ زيادةِ الإيمانِ ونقصانهِ ﴾ کە باس لە زیادبوون و کەمبوونی باوەڕ دەکات ، هی مامۆستای پایە بەرز عبدالرزاق البدر خوای گەورە بیپارێزێت .

خۆشەویستان شەرەف و ڕێزی مرۆڤی موسوڵمان لەوەدایە کە هەمیشە لە پێشبڕکێدا بێت بۆ نزیکبوونەوە لە خوای پەروەردگار بەڵام ئەو نزیکبوونەوەیە نایەتە بەرهەم بە پاراستنی سنوورەکانی خوای گەورە نەبێت لەگەڵ دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی وە هەر ئەوەشە هۆکاری زیادبوون و بەرزبوونەوەی باوەڕی بەندەیە لای پەروەردگاری مەزنمان ، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ جیاوازیەکی زۆر دەبینرێت لەناو ئومەتی ئیسلامیدا لەو ڕووەوە لەگەڵ ئەوەی چینی سەرەتای ئەم ئومەتە خۆشحاڵ و خۆشگوزەران بوون بەهۆی بوونی باوەڕێکی دامەزراوو نزیکبونەوەیان لەخوای پەروەردگار بەڵام ئەم ڕۆ دەبینین کەکەسێك ڕۆژێك کارێکی چاکە ئەنجام بدات ئەوا چەند ڕۆژێك لەکار دەکەوێت ئەویش بەهۆی پەلەکردنە لەگەیشتن بەبەربووم و پێگەیشتنی ، ئەمەش بەبۆنەی کەم زانستیە لەبەرنامەی پێغەمبەر ﷺ و پشتکردنە لەئاینی پەروەردگار بەڵام هەرکەسێك بیەوێت بۆلای پەروەردگار بڕوات و باوەڕێکی دامەزراوی هەبێت ئەوا با شوێن پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەوێت چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور: ٥٤ واتە ﴿ پێیان بڵێ : گوێڕایەڵی ڕاستەقینەی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بن خۆئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو ڕاستیان نەوت ئەوا بەڕاستی زیانتان هەر بەخۆتان گەیاندووە چونکە ئەو پەیامبەرە ﷺ تەنها ئەرکی ڕاگەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە ئێوەش بەرپرسی ئەرکی سەرشانی خۆتان دەبن ، خۆئەگەر فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی ئەو بن ئەوا ڕێنوێن و بەختیار دەبن دڵنیاش بن کە پێغەمبەر ﷺ تەنها ڕاگەیاندنی ئاشکراو ڕوونی لەسەر شانە ﴾ .

جاهەرکەسێك باوەڕی تەواو و دامەزراوی هەبێت ئەوا خۆی سوود مەند دەبێت لەدونیاو دوا ڕۆژدا .

خوێنەری بەڕێز : پایەکانی باوەڕ شەشن ئەویش باوەڕهێنانە بەباوەڕێکی تەواو بێ هیچ گومان و دوودڵیەك بەخوای گەورەو فریشتەکانی و پەرتووکە ئاسمانیەکانی و پێغەمبەرانی سەلامی خوا لەهەموویان بێت و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بەچاك و خراپییەوە هەروەك لەفەرمودەکەی جیبریلدا هاتووە لەگێڕانەوەی (عومەری کوڕی خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێت کەدەفەرموێت : .....قَالَ فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ. قَالَ « أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»[1]. واتە : جبریل سەلامی خوای لێ بێت فەرمووی هەواڵم بدەرێ دەربارەی باوەر ئەویش فەرمووی : (( باوەڕ ئەوەیە کە باوەڕت هەبێت بە خواو فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرەکانی سەلامی خوا لەهەموویان بێت و ڕۆژی دوایی و باوەڕت بەقەزاو قەدەر هەبێت بەخێر و شەڕیەوە )) .

بۆیە بەم ڕونکردنەوەیە بۆمان دەردەکەوێت کەپایەکانی باوەڕ شەشن جاتا بەندە باوەڕو زانست و هۆشیاری زیاتر بێت ئەوا باوەڕی زۆرتر دەبێت و لای خوای گەورە بەرزدەبێتەوە و دەبێتە هۆکاری دەربازبوونی لە ئاگری دۆزەخ ، جا ئامۆژگاری خۆم و هەموو موسڵمانێك دەکەم کەخەریکی خوێندن و خوێندنەوەی ئەم جۆرە پەرتوکانە بن تا باوەڕێکی سەلامەت و دامەزراویان هەبێت .

وەلەکۆتایدا ئەوەی شایەنی باسە دوای سوپاسی خوای گەورەو پەروەردگار ڕێزو سوپاسی خۆم دەردەبڕم بۆ برای بەڕێزو خۆشەویستم مامۆستا ئاکۆی بەڕێز لەسەر یارمەتی دان و ماندوبونی لەگەڵمدا بۆ تەواو کردنی ئەم کارە ، داوا کارم لەخوای گەورە منیش و ئەویش و هەموو موسڵمانێك مۆفەق بکات بۆکاری چاکە .

براتان

زانا فاروق حمە رشید

١٩ – شوال – ١٤٣٤ کۆچی

شاری سلێمانی

---

[1] صحيح مسلم للنيسابوري (١/ ٢٨)

## ﴿ پێشەکی دانەر بۆ چاپی یەکەم ﴾

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذ بِالله من شُرُوْرِ أنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَات أعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلاّالله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ ... وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾

أمَّا بَعْدُ: فَإنَّ أصْدَقَ الحَدِيْثِ كلامُ الله وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.

شاراوەنیە باوەڕ چەند پلەیەکی بەرز و چەند جێگایەکی بڵندی هەیە گرنگترینی گرنگەکان و پێویستترینی پێویستیەکان و گەورەترین و بەنرخترینیانە بە ڕەهایی ، وە هەموو چاکەیەك لە دنیاو دوارۆژدا وەستاوە لەسەر بوونی باوەڕ و دروستیەتی و سەلامەتیەکەی ، وە بۆ باوەڕ هەیە چەندین سوودی زۆر و بەروبوومی گەیو و خۆش و خواردنی بەردەوام وە چاکەی هەمیشەیی .

وە لێرەدا چست و چالاکەکان بەخێرایی هەستان و پێشبڕکێ کارەکان دەستیان کرد بە پێشبڕکێ بۆ گوێدان بە تەواو کردن و هێنانەدی باوەڕ ، کەسی موسوڵمانی سەرکەوتوو پێویستە بایەخدانی بەباوەڕی لە هەموو شتێکی تر گەورەتر بێت ، وە کاتێك کە پێشینەی و سەرەتاو چاکترینی ئەم ئومەتە بە کردەوە ئەم ڕاستیەیان هێنایە دی بایەخدانیان بە باوەڕیان دیار و ئاشکرا و گەورە بوو .

ئەوان ڕەزای خوایان لێبێت پەیمانیان لەگەڵ باوەڕیاندا بەستبوو ، وە کارەکانیان بۆ بەهێز بوونی باوەڕیان دۆزیبۆوە و ئامۆژگاری یەکتریان پێ دەکرد ، وتە لێیانەوە دەربارەی ئەم باسە زۆرە :

١ـ عومەری کوڕی خەطاب ( ڕەزای خوای لێبێت ) بە هاوەڵەکانی دەیفەرموو : (وەرن ئامادەبن با باوەڕمان زیاد بکەین ) وە لە دەربڕینێکی تردا هاتووە کە دەیفەرموو: ( وەرن با باوەڕمان زیاد بکەین ) .

٢ـ وە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەیفەرموو : ( بابەیەکەوە دابنیشین تا باوەڕمان زیاد بکەین ) ، وە لە دوعاو پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو : (پەروەردگارا باوەڕ و یەقین و تێگەشتنم زیاد بکە ) .

٣ـ وە موعاذی کوڕی جەبەل ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەیفەرموو : ( بابەیەکەوە دابنیشین ساتێك باوەڕمان زیاد بکەین ) .

٤ـ وە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەستی چەند کەسێکی لە هاوەڵانی دەگرت و دەیفەرموو : ( وەرن با ساتێك بە باوەڕەوە بەسەر بەرین ، وەرن با یادی خوای گەورە بکەین و باوەڕمان زیاد بکەین بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ، بەشکم خوای گەورە بە لێ خۆش بوون و لێ بووردنی خۆی باسمان بکات ) .

٥ـ وە ئەبو دەرداء ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەیفەرموو : ( لە تێگەشتوویی بەندە ئەوەیە کە بزانێت ئایە باوەڕی بەروە زیاد بوون دەڕوات یاخود بەرەو کەم بوون ، وە لە تێگەشتوویی بەندە ئەوە کە بزانێت دوودڵی و وەسوەسە و لەخشتەبردنەکانی شەیتان لە کوێوە بۆی دێت ) .

٦ـ وە عومەیری کوڕی حەبیبی خەطمی ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەیفەرموو : ( باوەڕ زیاد دەکات و کەمیش دەکات ، پێی وترا : بەچی زیاد و کەم دەکات ؟ فەرمووی : هەر کاتێك یادی خوای گەورەمان کرد و سوپاسمان کرد و بە پاکمان ڕاگرت ( واتە : سبحان الله ـ مان کرد ) ، ئەوە زیاد بوونێتی ، وە هەر کاتێك لێی بێ ئاگا بووین و لەدەستمان داو لە یادمان کرد ئەوە کەم بوونەکەیەتی ) .

٧ـ وه عەلقەمەی کوڕی قەیسی نوخەعی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کە یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی تابعی دەیفەرموو بە هاوەڵەکانی : ( بابڕۆین باوەڕمان زیاد بکەین ) .
٨ـ وه پرسیار کرا لە ئەوزاعی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) ئایە باوەڕ زیاد دەکات ؟ فەرمووی : ( بەڵێ هەتا وەك کێوێکی لێدێت ، وە وترا کەمیش دەکات ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەوندە کەم دەکات هەتا وای لێدێت کە نەمێنێت ) .
٩ـ وه پرسیار کرا لە پێشەوای ئەهلی سوونە و جەماعە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەربارەی باوەڕ کە ئایە زیاد و کەم دەکات ؟ فەرمووی : (زیاد دەکات بەئەندازەی ئەوەی هەتا دەگاتە سەرو حەوت ئاسمانەکە ، وە ئەوەندەش کەم دەکات هەتا دەگاتە خواروو حەوت چینی زەوی ) .
وه (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەیفەرموو : ( باوەڕ وتە و کردەوەیە ، زیاد و کەم دەکات ، کاتێك چاکەت کرد زیاد دەکات وە کاتێك خراپەت کرد کەم دەکات ) .
وتە لەبارەیانەوە زۆر زۆرە ، وە هەروەها هەر کەسێك بیر لە ژیانیان بکاتەوە و هەواڵەکانیان بخوێنێتەوە زۆر بایەخدانیان دەزانێت بە باوەڕیان و گرنگیان چەندە بۆی هەبووە .
بێگومان ئەو کۆمەڵ هەڵبژاردەیە زانیان کە بۆ باوەڕ چەند هۆکارێك هەیە پێی زیاد دەکات و بەهێز دەبێت و نشەونمای پێ دەکات ، وە چەندین هۆکاریش هەیە کە پێ کەم دەکات و لاوز و بێ هێزی دەکات ، بۆیە کۆششیان کرد لەو کارانەی کە باوەڕیان پێی تەواو بەهێز دەبێت ، وە زۆر بە ئاگا بوون لە هەموو ئەو هۆیانەی کە باوەڕ پێی کەم و بێ هێز دەبێت ، ئا بەوە بوون بە مرۆڤە چاك و بەرزە هەڵبژاردەکان .
هەر لەبەر ئەمە بێگومان لە ناسینی ئەم هۆکارانە مەبەستم : هۆکارەکانی زیاد بوون و کەم بوونی باوەڕ ، چەندین سوو د قازانجی زۆر و چڕ و پڕ هەیە ، بەڵکو پێویستی زۆرە بۆ ناسینیان و بایەخ پێدانیان و شارەزابونیان و ناساندنیان ، چونکە باوەڕ بەڕاستی تەواویەتی بەندەیە و ڕێگەی نەجات و سەر فرازیەتی ، هەر بە باوەڕ پلەوپایەی لە دنیا و دوارۆژدا بەرز دەبێتەوە ، وە هۆکار و ڕێگەی هەموو چاکەیە لە ئێستا و داهاتووشدا

بۆیە باوەڕ نە دەست دەکەوێت و نە بەهێزو پتەو و تەواو دەبێت تەنها بە ناسینی ڕێگا و هۆکارەکانی نەبێت.

بۆیە جێی خۆیەتی بۆ ئەو کەسە موسوڵمانەی بەتەنگ خۆشگوزەرانی خۆیەوە دەچێت و ئامۆژگاری دەروونی خۆی دەکات هەوڵ بدات بۆ ناسینی ئەو هۆکارانە و بیریان لێ بکاتەوە و پاشان جێبەجێی بکات لەژیانیدا ، بۆ ئەوەی باوەڕی زیاد بکات و یەقینیشی پتەو ببێت وە ناخ و دەروونی خۆیشی لە هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ دوور بخاتەوە و بیشی پارێزێت لە کەوتنە ناوی ، بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە دوارۆژە زیان بەخش و سەرئەنجامە بەئێشەکەی ، جا هەر کەسێك یارمەتی درابێت بۆ ئەمە ئەوە یارمەتی و هاوکاری کراوە بۆ هەموو خێر و چاکەیەك .

شێخی زانا و پایە بەرز عەبدلرەمانی سەعدی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بەندەی باوەڕ داری ڕێنویی کراو هەوڵ بۆ دوو شت دەدات :

١ـ دامەزراندن و هێنانە جێی بنەماکانی باوەڕ و لق و پۆپەکانی وە جێ بەجێ کردنی بە زانست و کردەوە و حاڵی خۆی دەبێت .

٢ـ هەوڵ دان بۆ نەهێشتنی ئەو شتانەی کە نەفس و دەروونی لەناو دەبات یاخود کەم و بێ نرخی دەکات لە فیتنە دیار و شاراوەکان ، وە چارەسەری ئەو کەم تەرخەمیەش دەکات کە تیایدایە یەکەم جار وە پاشان ئەوەشی کە وێراویەتی بیکات دووەم جار بە تەوبەیەکی پاك و خاوێن و گەیشتن بە کاروان پێش لەدەست دانی [٢] .

وە لێرەوە بۆت دەردەکەوێت برای خۆشەویستم ئەم کتێبەی کە لەبەردەستدایە ، ڕوونکردنەوەی گرنگترین هۆکارەکانی زیاد بوون و کەم بوونەوەی باوەڕی تێدایە ، لە بناغەدا ئەم کتێبە بەشێك بوو لەم کتێبەم (زیادة الإيمان و نقصانه و حكم الإستثناء فيه[٣])

[٢] ( التوضيح و البيان لشجرة الإيمان ) ( ص : ٣٨ ) .
[٣] وهو مطبوع .

هەندێك لـه خۆشەویستان و بەڕێزان داوایان لێکردم کە بە سەربەخۆیی دەری کەم بـۆ ئەوەی کە هەمووان سوودی لێ ببینن وە سوپاس بۆ خوا بـە تـەوفیق و منـەتی خـوای گەورە ئەوە هاتە جێ .

وە کردم بە دوو بەشەوە :

بەشی یەکەم : هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ .

بەشی دووەم : هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ .

داوالەخوای گەورە دەکەم کەنیەتم چاك بکات و لێم وەربگرێت وەڕازیش بێت لێم

## ﴿ بەشی یەکەم ﴾

### هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ

بێگومان خوای گەورە بۆ هەموو خوازراوێك و داواکراوێك هۆکار و ڕێگـەی دانـاوە کە دەیگەیەنێت پێی ، وە لـە گرنگترین و گەورەترین و گشتی تـرین داواکراویـان کـە سوودی هەبێت باوەڕە ، وە بێگومان خوای گەورە چەندین بابەتی داناوە کەبەهۆیـەوە باوەڕ بۆخۆی وابەستە دەکات و بەهێزی دەکات ، وە چەند هۆکارێکی زۆریـش زیـاد دەکات پێی و نشەو نەمای پێدەکات ، ئەگەر بەندەکان کردیان دڵنیاییان بەهێز دەبێت و باوەڕیـان زیـاد دەبێـت ، وە خـوای گـەورەش لـە قورئانـدا ڕوونـی کردۆتـەوە و پێغەمبەرەکەشی ﷺ لە فەرموودەکانیدا .

بەو هیوایەی گرنگترینی ئەو هۆکارانە ئەمانە بێت کە دێت .

**هۆکاری یەکەم :-**

## فێربوونی زانستی بەسوود

**بێگومان گرنگترین و بەسوود ترین هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ فێربوونی زانستی بەسوودە ئەویش زانستی شەریعەتی ئیسلامە کە لە پەرتووکی خوای بالاّ دەست و فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ پێك هاتووە [٤].**

**حافظ ابن رجب ڕەحمەتی خوای لێبێت : پێناسەی ئەم زانستە دەکات و دەفەرموێت : زانستی بەسوود : لەبەرکردنی قورئان و فەرموودەکان و تێگەشتنی واتاکانیانە ، وە پابەند بوون لەوەدا بەو وتانەی کەهاتووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وە شوێن کەوتەکانیان و شوێن کەوەتەی شوێن کەوتەکانیان لە واتای قورئان و فەرموودە دەبێت ، وە لەو وتانەوەی کە لێیانەوە هاتووە لە بابەتە حەلاڵ و حەرامەکان و ، خۆپاراستن و نەرم و نیانی و ناسینی بابەتەکان ، وە جگە لەوانەش ئیجتیهاد کردن یەکەم جار لەسەر جیاکردنەوەی ساغەکانی لە نەخۆشەکانی ، پاشان ئیجتیهاد کردن دووەم جار لەسەر وەستانی واتاکانی و تێگەشتنی ، وە ئەمە بەسە بۆ کەسێك کە ئەقڵ و هۆشی هەبێت وە خۆی خەریك بکات بە زانستی بەسوودەوەو گوێی پێبدات....)) [٥]**

---

[٤] سوودێك : شەیخ الاسلام ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت : داواکردنی زانستی شەرعی فەرزی کیفائیە جگە لەوە نەبێت کە فەرزی عەینیە ، وەك داواکردنی هەموو کەسێك لەو زانستەی کە خودا فەرمانی پێکردووە و لێی قەدەغە کردووە ، جا ئائەوە فەرزی عەینیە . ( الفتاوی) ـ ٢٨:٨٠ ـ جا فەرزی کیفائی ئەوەیە کەیەکێك پێی هەستێت لەسەر ئەوانی تر لادەچێت وەك نوێژی جەنازە ، وە فەرزی عەینیش ئەوەیە کە لەسەر هەموو کەس پێویستە وەك فێر بوونی بیروباوەڕ . " وەرگێڕ "

[٥] (( فضل علم السلف علی علم الخلف )) . ( ص : ٤٥ ) .

وە حافظ ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێبێت : فەرموویەتی : مەبەست بەزانست : زانستی شەرعییە ئەوەی کە لە شارەزابونیدا سوودی ئەوە دەبەخشێت کە پێویستە لەسەر کەسی پێگەیشتوو لە کاروباری ئاینەکەی لە عیبادەتەکانی و مامەڵەکانی ، وە زانست بە خوداو صیفەتەکانی ، وە ئەوەشی پێویستە لەسەری کە پێی هەستێت ، وە پاك ڕاگرتنی خودا لە کەم و کورتی ، وە تەوەری ئەمەش وەستاوە لەسەر زانستی " تەفسیر و فەرموودە و فقه " [٦] .

جا هەرکەسێك مۆفەق بکرێت بۆ ئەم زانستە ئەوا مۆفەق کراوە بۆ گەورەترین هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ ، وە هەرکەسێك تێبڕوانێت و بیربکاتەوە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەوا ئەوە دەزانێت .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٨

واتە : خوای گەورە لەڕێگەی دروست کراوەکانیەوە شایەتی داوە ، خۆهەر خۆی بەسە بۆ شایەتی وە پاشان فریشتەکان و زاناکانیش شایەتی دەدەن کە هیچ پەرستراوێك شیاوی ڕاستەقینە نییە وە هەموو کاتێکیش لە نێو بوونەوەردا دادپەروەری ڕاگرتووە ، وە دووبارە هیچ پەرستراوێکی تر شیاوی ڕاستەقینە نییە ، وە خودا بالاً دەست و زاڵ و کار جوان و خاوەن حیکمەتە .

وەرگێڕ : ـ لەم ئایەتەدا گەورەیی خاوەن زاناکانمان بۆ دەردەکەوێت چونکە خوای گەورە جیایی کردنەوە لەکۆی بوونەوەرو وە شایەتی خۆی و پاشان فریشتەکانی لەگەڵ ئەواندا بەیەکەوە باس کرد ، وە پێویستە لەسەر خەڵکیش ئەو شایەتییە پڕ لە دادوەرییە قبوڵ بکەن .

---

[٦] فتح الباري (( ١٤١:١ )) .

خــوای گــەورە دەفــەرموێت :﴿ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾ ﴾ النساء: ١٦٢

واتە : بەڵام زاناكانیان ئەوانەی کە لـە زانـستدا ڕۆچـوون و زۆر شـارەزا و خـاوەن زانستن وە خەڵکە باوەڕدارەکانیان ئەوانەی کـە بڕوایـان بـەو کتێبـە هەیـە کـە بۆتـۆ نێردراوەتە خوارەوە وە بەوانەشی کە پێش تۆ نێردراوەتە خـوارەوە ئەوانـەی بەباشـی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن و وە هەروەها زەکـات دارانیـان و ئەوانەشـی باوەڕیـان بـە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە ئابەوانە پاداشتێکی گەورە دەبەخشین .

خــوای گــەورە دەفــەرموێت :﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ الحج: ٥٤

واتە : دەبا ئەو کەسانەی کە زانست و زانیاری بەسوودیان پێ بەخشراوە چـاك بـزانن کە ئەو قورئانە ڕاست و دروستەو لەلایەن پەروەردگارتەوەیە ، جابا ئـەوانیش بـاوەڕی پێ بهێنن ، وە دڵەکانیـشیان تەسـلیمی ببێـت و لـە گومان و ئـەملاولا بکـەوێت ، وە بێگومان خودای گەورە هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە دەکات کە باوەڕیان هێناوە بۆ ڕێگەی ڕاست .

خوای گـەورە دەفـەرموێت :﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾ سبأ: ٦

واتە : ئەوانەش کە زانستیان پێ بەخشراوە ، واتە : لـە پێغەمبەروﷺ لەگەڵ هـاوەڵان ﷺ سوور دەزانن ، ئەوەی کە بـۆت نێـردراوە لەلایـەن پەروەردگارتـەوە هـەر ئـەوە ڕاست و درووستە ، وە بۆ ڕێگایی پەروەردگاری خاوەن دەسـەڵات و سـوپاس کـراو ڕێنموویی دەکات .

خوای گەورە دەفـەرموێت :﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر: ٢٨

واتە : بەڕاستی لەبەندەکانی خوادا هەر زاناکان لــە خــودا دەترســن ، چــونکە ئــەوان لەهەموو کەس زیاتر خودا دەناسن کە خاوەنی چ دەســەڵاتێکە ، وە بێگومــان خــوای گەورە دەسەڵات دارو لێبووردەیە .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة: ١١

واتە : ئەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە خودا بەرزیان دەکاتــەوە وە ئەوانەشــتان کــە زانستیان پێدراوە پلەیان بەسەر باوەڕداراندا بەرزدەکاتەوە ، وە خوای گەورە بەئاگایــە بەوکارو کردەوانەی کە ئێوە دەیکەن .

وَفِي الصَّحِيحَينِ : مِنْ حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ( مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ) [٧] .

واتە : لـە صەحیحی هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێبێــت ، لــە فەرموودەی موعاویــە (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەڵــێ : پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویــەتی : (هەرکەسێك خودا ویستی چاکەی پێی هەبێت ئەوا تێگەشتوی دەکات لـە دین ) .

وَفِي " المُسْنَدِ " وَ غَيرِهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ( مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمَاً سَلَكَ اللهُ بِهِ طَرِيقاً مِنْ طُرقِ الجَنَّةِ ، وَ إِنَّ المَلائِكَةَ لَتَـضَعُ أَجْنِحَتَهَـا لِطَالِبِ العِلْمِ ، رِضىً بِمَا يَصْنَعُ ، وَ إِنَّ العَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَ مَـنْ فِـي الأَرْضِ وَالحِيتَانُ فِي جَوْفِ المَاءِ ، وَ إِنَّ فَضْلَ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِ القَمَـرِ لَيلَـةَ البَـدْرِ

[٧] أخرجه البخاري ( ١٦٤،١) (٢١٧،٦) (٢٩٣،١٢فتح) ، مسلم (١٥٢٤،٣)

عَلَى سَائِرِ الكَوَاكِبِ ، وَ إِنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ ، وَ إِنَّ الأَنْبِيَـاءَ لَـمْ يُورِّثُـوُا دِينَـاراً وَلاَ دِرْهَمَاً ، إِنَّمَا وَرَّثُوا العِلْمَ ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ ) [٨] .

واته : لـه موسنەدی ئیمام ئەحمەد دا وه جگه لـەویش لـه فـەرموودەی ئـەبی دەردائـەوه (ڕەزای خوای لێبێت ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( هەر کەسێك ڕێگایـەك بگرێت كه داوای زانستی تێدا بکات ئەوا خـوای گـەوره دەیخاتـه سـەر ڕێگایـەك لـه ڕێگاکانی بەهەشت ، وه بێگومـان فریـشته بـاڵی دادەنێـت بـۆ داواکـاری زانـست ، لەڕەزامەندی ئەو کارەی که دەیکات ، وه بێگومان مرۆڤی زانـا داوای لێبـوردنی بـۆ دەکەن چی لە ئاسمانەکان و چـیش لـه زەویدایـه وه هـەتا ماسـیش لـەناو ئـاودا ، وه بێگومان فەزڵی مرۆڤی زانا بەسەر مرۆڤی خوا پەرست وەك فەزڵی مانگی چوارده وایه له شەوێکی ساماڵدا بەسەر باقی ئەستێرەکاندا ، وه بێگومـان زاناکـان مـیرات گـری پێغەمبەرانن ( سەلاّت و سەلامی خوایان لێبێت ) ، وه بێگومان پێغەمبەران ( سەلاّت و سەلامی خوایـان لێبێـت ) میراتیان لێنابرێت نه دینار و نه درهەم ، بەڵکو ئەو میراتەی که لێیـان دەبرێـت زانسته ، جا هەر کەسێك وەری بگرێت ئەوا بەشێکی زۆری گرتووه) .

وَفِي التِرمِذِي وَ غَيرِهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (فَـضْلُ العَـالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُم ، وَإِنَّ اللهَ عزوجل وَ مَلاَئِكَتَهُ وَ أَهْلَ السَّمَاوَاتِ الأَرْضِ ، حَتَى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَ حَتَى الحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخَيرَ ) [٩] .

واته : لـه سونەنی ترمزیدا وه بێجگه لـەویش لـه فەرموودەی ئەبی ئومامەدا (ڕەزای خـوای لێبێـت ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( فەزڵی مرۆڤی زانا بەسـەر مرۆڤـی خوا پەرست وەك فەزڵی من وایـه بەسـەر پلـه نـزم ترینتانـەوه ، وه بێگومـان خـوای بالاّدەسـت و فریـشتەکان و خـەڵکی ئاسمانـەکان و زەوی ، وه هـەتا مێروولـەش لـه

---

[٨] (( المسند )) ( ١٩٦،٥ ) ، ورواه أبو داود ( ٣١٧،٣) ، والترمذي ( ٤٩،٥) ، وابن ماجة ( ٨١،١) ، والـدارمي ( ٩٨،١) ، وابـن حبان ( ١٥٢،١ الإحسان) ، وصححه الألباني ، انظر (( صحيح الجامع )) ( ٣٠٢،٥) ، وقد شرحه ابن رجب في جزء مفرد فليراجع .

[٩] رواه الترمذي ( ٥٠،٥) ، و ذكره المنذري في (( الترغيب و الترهيب )) ( ١٠١،١) ، و نقل عن الترمذي أنه قال : ( حديث حسن صحيح ) ، وصححه الألباني . انظر (( صحيح الترمذي )) (٣٤٣،٢) .

کونەکەیدا وە نەهەنگیش درورد لەسەر ئەو مامۆستایە لێدەدەن کە چاکە فێری خەڵك دەکات ) .

ئەم دەقانەی کە باسکرا ڕوونی و بەڵگەی پلەو پایەی زانستی تێدایـە ، وە گـەورەی و گرنگی حاڵی زانستی تێدایە ، وە ئەو پلانـەی کـە لەسـەری هـاتووە لـە شـوێنەواری سوپاس کراوو خەسڵەتی بەرزو جوان لە دونیا و دوارۆژدا ، وە ئەو دەرئەنجامەی کـە لێوەی دەردەچێت لە زەلیلی و ملکەچی بۆ شەرع خودا ، وە گوێڕایەڵی و کارکردن بە فەرمانی ، وە مرۆڤی زانـا خـوای خـۆی دەناسـێت ، وە پێغەمبەرەکەشـی ﷺ ، وە فەرمانەکانی و سنوورەکانیشی دەناسێت ، وە جیایی دەکاتەوە ئەوەی کە خودا خۆشی دەوێت و لێشی ڕازییە وە ئەوەشی پێی ناخۆشەو قەدەغەشی کردووە ، وە کار دەکات بە فەرمانی خودا ئەوەی کە دەیکات و وازیـشی لێـدەهێنێت ، ئائەمـە ئەگـەر مۆفـەق بکرێت بۆ ئەو کارانەی کە زانستی پێی هەیە ئەگینا زانستەکەی دەبێت بە تـاڵی و ژان لەسەری .

ئاجوری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە پێشەکی کتێبەکەیدا ( أخلاق العلماء ) دا دەفەرموێت : بێگومان خوای بالأدەست ناوەکـانی بـەرز و پیرۆزبێـت تایبەنـد مەنـدی کـردووە لـە درووست کراوەکانیدا ئەوانەی کە خۆشی دەوێت ئینجا ڕێنموی کردوون بۆ ئیمـان ، پاشان تایبەندمەندی کردووە لە لە بـاقی ئیمانـداران ئـەوەی کـە خۆشـی دەوێـت وە فەزڵیشی داون بەسەر ئەواندا بەوەی کە فێری قورئان و سونەتی کردوون ، وە تێـشی گەیاندوون لە دین ، وە فێری لێکدانەوەی دەقەکانیشی کردوون ، وە فەزڵیشی داون بەسەر باقی ئیمانداراندا ، وە ئەوەش لە هەموو کـات و سـەردەمێکدا هەیـە ، بـەرزی کردوونەتەوە بە زانست وە جوان و ڕازاوەی کردوون بە لەسەر خۆیی ، هـەر بـەوان دەناسرێتەوە حەلاڵ لە حەرام ، وە ڕاستی لـە بەتاڵ ، وە بێسـود لـە سوود بـەخش ، وە جوان لـە ناشرین ، وە فەزڵیان گەورەیـە وە بیروهۆشـیان فراوانـە ، وە مـیرات گـری پێغەمبەرانن ( سەلاّت و سەلامی خوایان لێبێت ) ، وە ئـارامی چـاوی خۆشەویـستانی خـودان ، ماسی لە دەریادا داوای لێبوردنیان بۆ دەکات ، وە فریشتە باڵیان بـۆ دادەخـات ، وە

زانایان لە ڕۆژی دوایدا دوای پێغەمبەران ( سەلاَت و سەلامی خوایان لێبێت ) ، شەفاعەت دەکەن ، دانیشتنەکانیان سوودی دانایی لێوەردەگیرێت ، وە بەکردەوەکانیان خەڵکی بێ ئاگا وو وریادەبێتەوە ، ئەوان فەزڵیان زیاترە لە مرۆڤی خوا پەرست ، وە بەرزترن لە دونیا نەویست ، ژیانیان دەست کەوتە ، مردنیان بەلاو موصیبەتە ، بێ ئاگا بەهۆش دەهێننەوە ، نەفامان فێردەکەن ، وە شوومی و نارەحەتییان لێوە پەیدا نابێت ، وە ترسی نەهامەتیان لێناکرێت ، بەجوانی فێرکردنی جگە لەخۆیان ئەوانەی گوێڕایە ڵییان دەکەن پێشبڕکێ دەکەن بۆ گوێڕایەڵی کردنیان ، وە بەئامۆژگاری جوانیان کەم تەرخەمان دەگەڕێنەوە لە کەم تەرخەمییان ، وە هەموو بوونەوەر پێویستیان بە زانستیانە ... )) هەتا دەفەرموێت : ئەوان ڕۆشنایی بەندەکانی خودان ، وە منارەی وڵاتن ، وە ڕاگری ئومەتن ، وە کانی دانایین ، وە ڕقی شەیتانن ، هەر بەوان دڵی خاوەن ڕاستی زیندوو دەبێتەوە ، وە دڵی خاوەن ئارەزووەکان دەمرێت ، وە وێنەیان لەزەویدا وێنەی ئەستێرەکانە کە ڕێی پێدەدۆزرێتەوە لە تاریکایکانی وشکانی دەریاکاندا ، کاتێك بکوژێنەوە خەڵکی سەریان لێدەشێوێت وە کاتێك تاریکی لەسەر لاچوو دەبینن ))[10]

پاشان ئاجوری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) چەند دەقێکی لە قورئان و سونەت و وتەی زانایان هێناوە کە پاڵپشتی ئەو وتانە دەکات کە خۆی فەرموویەتی .

جا زانست پلەیەکی بەرزی هەیە ، وە جێگایەکی بەرزی هەیە ، وە لەگەورەترین ئەو بەڵگانەی کە فەزڵ و گەورەیمان بۆ ڕوون بکاتەوە ئەم وتەیەی خودای بالاَ دەستە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة: ١١

واتە : ئەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە خودا بەرزیان دەکاتەوە وە ئەوانەشتان کە زانستیان پێدراوە پلەیان بەسەر باوەڕداراندا بەرزدەکاتەوە .

[10] أخلاق العلماء ( ص ١٣،١٤)

جا وتراوه دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە : خـوای گـەورە مرۆڤـی بـاوەڕداری خـاوەن زانست بەرز دەکاتەوە بەسەر مرۆڤی باوەڕداری بـیٚ زانـست ، وە بـەرزی پلـەو پایـە بەڵگەیە لـەسەر فەزڵ ، کەواتە مەبەست پێی زۆری پاداشتە ، وە بـە پاداشـتیش پلـە و پایە بەرز دەبێتەوە ، وە بەرزی پلە و پایە لـە دونیـادا دەگرێتـەوە بـە بـەرزی پلـەو وە بەباش باس کردن ، وە بینینی ئەو پلەو پایەیـە لـە دواڕۆژدا بەبـەرزی پلـەو پایـە لـە بەهەشتدا )) [11] .

وە هەروەها وتەی خودای گەورە : ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ طه: ١١٤

واتە : ئەی پەروەردگارا زانست و زانیاریم زیاد بکە .

جا بەڵگەی ئەم ئایەتە لـەسەر فەزڵ و گەورەیی زانست دیارە ، چونکە بێگومان خـوای گەورە فەرمانی نەکردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەداواکاری زیادە لەهیچ شتێکدا جگە لە زانستدا نەبێت ، لـەوەی کـە لەسـەری هـاتووە لـە زیـادەی بـاوەڕو دامـەزراوی لـەسەری ، وە خودای گەورە دەفەرمویٚ : ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران: ٧

واتە : خوای گەورە دەفەرمویٚ : ئەوانەش کە لـەزانستدا ڕۆچوون و زۆر دەزانن دەڵێن ئێمە باوەڕمان هەیە بە هەموو ئـەو شـتانەی کـە لـەلایـەن پەروەردگارمانەوەیـە ، خـۆ لـەڕاستیدا هەر خاوەن بیرو هۆش و وورد بینەکان و وشیارەکان بیردەکەنەوە .

وە ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە کـە دەفـەرموێت : ﴿ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ النساء: ١٦٢

واتە : بەڵام زاناکانیان ئەوانەی کـە لـە زانـستدا ڕۆچـوون و زۆر شـارەزا و خـاوەن زانستن وە خەڵکە باوەڕدارەکانیان ئەوانەی کـە بڕوایـان بـەو کتێبـە هەیـە کـە بۆتـۆ نێرردراوەتە خوارەوە وە بەوانەشی کە پێش تۆ نێردراوەتە خوارەوە .

---

[11] فتح الباري " لابن حجر ( ١٤١،١ )

وه ئەو فەرمایشتەی خوای گـەوره کـه دەفـەرمویّت : ﴿ شَهِـدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ ال عمران: ١٨

واته : خوای گەوره لەڕێگەی دروست کراوەکانیـەوه شـایەتی داوه ، خۆهـەر خـۆی بەسه بۆ شایەتی وه پاشان فریشتەکان و زاناکانیش شایەتی دەدەن که هیچ پەرستراوێك شیاوی ڕاستەقینه نییه وه هەموو کاتێکیش لە نێو بوونەوەردا دادپەروەری ڕاگرتـووه ، وه دووباره هیچ پەرستراوێکی تر شیاوی ڕاستەقینه نییه ، وه خودا بالاّ دەست و زاڵ و کار جوان و خاوەن حیکمەته .

وه ئەم ئایەتەی کۆتاییـان ابـن قـیم ( ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ) بەحـسێکی چـڕوپڕی دەربـارەی نووسـیوه ، وه ڕوونـی کردۆتـەوه بەڵگـەکانی لەسـەر زانـست لەچـەند ڕوویەکەوه ، نزیکی ١٥٠ ڕووی لێـوه بـاس کـردووه ، لـه پەرتووکـه بەنرخەکەیدا کەناوی ناوه ( مفتاح الدار السعادة ) یه بڕوانه لە لەپەڕەی ٥٢ بەدواوه .

وەلەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەردا ﷺ ( مَـنْ يُـرِدِ اللهُ بِـهِ خَيْـراً يُفَقِّـهُ فِـي الـدِّينِ )[١٢] .

(هەرکەسێك خودا ویستی چاکەی پێی هەبێت ئەوا تێگەشتوی دەکات لە دین ) .

لە گەورەترین ئەو شتانەی گەورەیی زانست و هەڵگرانی ڕوون و ڕۆشن دەکەنەوه ، وه هەرکەسێك مۆفەق کرابێت بۆ زانست ئەوا مۆفەق کراوه بـۆ هـەموو چـاکەیەك ، ڕێنیشاندەرمان بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە وشەی ( خیر ) ه کـه بەنەناسـراوی هـاتووه لـه فەرموودەکەدا بۆئەوەی شمولی هەموو خێرەکان بکات وه کەم و زۆری بگرێتەوه.

جا ئەمە هەمووی لە فەزڵ و بەخشندەیی و گەورەیی چاکەی خودایە بەسەر کەسێکەوه مۆفـەق کرابێـت بـۆ زانـست ، وه بەپێـچەوانەشەوه بەبەڵگـەی ئـەم فەرموودەیـە هەرکەسێك زانستی لێ حـەرام کرابێـت ئـەوا هـەموو خێرێکـی لـێ حـەرام کـراوه.

(مەبەست لە خێر ئەو فەزڵە گەورەیەیە کـه زاناکـان لـه دونیـا و دوا ڕۆژدا هەیانـه) وەرگێڕ .

---

[١٢] متفق عليه .

ابن قیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێك لەدین شارەزا نەکرابێت ئەوا ویستی خێر بەو نەبەخشراوە ، هەروەك چۆن خودا ویستی خێری بەکەسێك هەبێت لەدین شارەزای دەکات ، وە هەرکەسێك لەدین شارەزا بێت ئەوا ویستی خێری بەو بەخشراوە ، ئەگەر مەبەست بەو زانستە داواکاری کردنی کاری چاکە بکات ، بەڵام ئەگەر تەنها ویستی فێربونی زانست بێت ئەوا بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کەفێری دین بووە ویستی خێری پیێ بەخشرابێت ، چونکە بێگومان شارەزا بوون لە دیندا لەکاتی بەخشینیدا ( واتە لەلایەن پەروەردگارەوە ) دەبێت بەمەرجێك بۆ کاری چاکە پێی ، کەواتە لەسەر یەکەم جار فێربوونی زانست پێویستە وە خوا لەهەموو کەس زانا ترە [١٣]. ( مەبەست لەسەر یەکەم جار واتە بڕگەی یەکەم ئەو بڕگەیەی کە تێدا فەرمووی : هەرکەسێك لەدین شارەزا نەکرابێت ئەوا ویستی خێر بەو نەبەخشراوە ، کەواتە زانست پێویستە بۆ ئەوەی کەکاری چاکە بکات ) . وەرگێڕ .

وە حافظ ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێبێت : فەرموویەتی : تێگەشتن لەفەرموودەکە ئەوە دەبەخشێت کە هەرکەسێك لە دین شارەزا نەبێت ، واتە : بنەماکانی ئیسلام نەزانێت و فێر نەبوبێت لەگەڵ ئەو بەشانەی کە پەیوەندییان پێوەی هەیە ئەوا بێبەش کراوە لە خێر ، چونکە هەرکەسێك کاروباری دینەکەی خۆی نەناسێت ئەوا نە شارەزایە لەدین و نە فێرخوازی زانستیشە ، جا ئەو کاتە دروستە کە وەصف بکرێت بەوەی کە ویستی خێر بەو کەسە نەبەخشراوە ، وە هەر لەمەدا دەردەکەوێت گەورەیی زانایان بەسەر سەرجەم خەڵکیدا ، وە گەورەی تێگەشتنیش لە دین بەسەر باقی زانستەکانی تردا ) [١٤] بەتەنها زاستە ئەو پێگە گەورەی دەستی خۆی خستوە لەبەر هۆکارە بۆ گەورەترینی مەبەستەکان کەئەویش : پەرستنی خوای گەورەیە بەتاك و تەنها بێ هیچ هاوبەش پەیدا کردنێك بۆی وەهەستان بەتاك گرتنی بەو شێوەیەی داواکراوە ، جابۆیە زاست خۆی

[١٣] مفاتح دار السعادة ( ص ، ٦٥) وانظر : (( الفتاوى )) ٢٨،٨٠ .
[١٤] فتح الباری ( ١،١٦٥)

لەخۆیدا مەبەست نیە بەڵکو مەبەست لەفێربوونی بۆ جگە لەخۆیەتی کەئەویش کردنی کارە جابۆیە هەموو زانستێکی شەرعی تەنها بۆئەوەیە کە هۆکارێکە بۆ پەرستنی خـوای گەورە و باڵا دەست ، نەك بۆ هیچ شتێکی تر ، وە چەند شـتێك هەیـە کـە بەڵگەیـە لەسەر ئەوە :

یەکەم : بێگومان شەرع هاتووە بۆ پەرستنی خودای گەورە ، ئەوەش مەبەستە لە ناردنی پێغەمبەرمان ( سەلامی خویان لێبێت ) ، وەکو ئەم وتەیـەی خـودای گـەورە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ البقرة: ٢١

واتە : ئەی خەڵکینە تەنها پەروەردگاری خۆتان بپەرستن ئەو پەروەردگارەی کە ئێوە و بونەوەرانی پێش ئێوەی دروست کردووە ، بەڵکو ئێوە پارێزکار و دووربن لە تاوان .

﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ هود: ١

واتە : ئەم قورئانە کە لەلایەن خوداوە نێردراوە کتێبێکە کە هەموو ئایەتەکانی رێـك و جوان پڕ واتا و ڕاستە ، پاشان ڕوون کراوەتەوە لەلایەن خودای کاردروست و بـەئاگا بەهەموو شتێك {١} جا بۆیە خودا کتێبی دابەزاندووە لەبـەر ئـەوەی جگـە لـە " الله "زیاتر کەسی تر نەپەرستن .

وە هەروەها ئەم ئایەتەش : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٥

واتە : پێش تۆ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ هـیچ پێغەمبـەرێکمان ﷺ نـەناردووە مەگـەر نیگـا وسروشتمان بۆ کردووە کە هیچ پەرستراوێك مەپەرستن جگە لەمن نەبێت .

وە هـەروەها ئـەم ئایەتـەش : ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ﴾ الزمر:٢ - ٣

واتە : بێگومان بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە بەڕاستی و دروسـتی جـا خودا بپەرستە بـە ئـیخلاص و نیـەتێکی پاکـەوە وە هـاوەڵی بـۆ پەیـدا مەکـە لـەهیچ

ڕویەکەوە {٢} وە هۆشیار و بەئاگابە دینی جوان و چاك و پاك بێگەرد تەنها بۆ پەروەردگارە ، واتە ئەبێت بەندایەتیش تەنها بۆ ئەو بێت و دوور بێت لە هەموو خۆرافیات و هاوەڵ بۆ پەیدا کردنێك .

وە چەند ئایەتێکی تریش لەم بارەیەوە کە لەژمارده نایەت و زۆری دەوێت باس کردنی هەرهەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە زانست تەنها پەرستنی خودای بالآدەستە ، وە نەهێشتنی سەرجەم بەندایەتی و گوێڕایەڵیەکان هەر بۆ ئەونەبێت .

دووەم : ئەوەی لەو بەڵگانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ڕۆح و کرۆکی زانست کردەوەیە ، وە ئەگەر وانەبێت ئەوا زانست بێ کەڵك و سوود لێ وەرنەگیراوە .

بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر : ٢٨

واتە : بەڕاستی لەبەندەکانی خوادا هەر زاناکان لە خودا دەترسن ، چونکە ئەوان لەهەموو کەس زیاتر خودا دەناسن کە خاوەنی چ دەسەلآتێکە .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾[15]

واتە : ئایە ئەو کەسەی کە گوێ ڕایەڵەو لەساتەکانی شەودا وەستاوە بۆ نوێژ کردن و کڕنوش بردن بۆ خودا لە سزای دوارۆژ دەترسێت و خۆی دەپارێزێت و وە ئومێدی بە بەزەیی پەروەردگاری خۆی هەیەو بەتەمای بەهەشتیشە ، جا کەسێك کە وابێت وەك کەسی سەرپێچیکار وایە ؟ بڵێ ئەو کەسانەی کە زانا و شارەزان وەك کەسانی نەزان و نەشارەزا وەك یەك وان ؟ دیارە بێگومان هەرگیز وەك یەك نین جا بەو شێوازەش بڕوادار و بێ باوەڕ وەك یەك نین ، جا بۆیە تەنها مرۆڤە ژیرەکان بیردەکەنەوە و پەند و ئامۆژگاری وەردەگرن .

[15] الزمر: ٩.

جـا ئـەم بەڵگانـە و جگـە لەمانـەش بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کەزانـست هۆیەکـە لەهۆکارەکان ، وە تەنها خۆی ویست نییە لـە ڕوانگەی شەریعەتەوە ، بـەڵکو زانـست هۆیەکە بۆ کارکردن ، وەهەموو ئەو بەڵگانەی کە هاتووە دەربارەی گەورەیی زانست ئەوە چەسپاوە بۆی لەو ڕوانگەیەوەی کە زانست داوالێکراوە کە کردەوەی پێبکرێت. وە ئاشکراشە کە گەورەترینی زانستەکان بـوونی زانـستە بـە خـودای بالأدەسـت ، وە لەگەڵ ئەوەشدا ساغ و سەلامەت نییە لەوەی کە گەورەیی خاوەنەکەی دەربخات هەتا بەڕاستی نەی سەلمێنێت بەگوێرەی ئەو داخوازییەی کە لێکراوە ئەویش باوەڕ هێنانە بـە خودا [16] .

سێیەم : ئەودەقە شەرعیانەی کە جێگیر بووە لـە هەڕەشەی تونـد و تونـد و تیـژی لـە بەرامبەر ئەو کەسەی کە کار بەزانستەکەی ناکات ، وە بێگومان مرۆڤی زانا پرسـیاری لێدەکرێت سەبارەت بـەو زانـستەی کەچـی کردەوەیـەکی پێکـردووە ، وە بێگومـان هەرکەسێك کردەوە بەزانستەکەی نەکات ئەوا دەبێت بە بەڵا و ناڕەحەتی و پەشیمانی بۆی ، خودای بەرز و بڵند دەفـەرموێت : ﴿ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ البقرة: ٤٤

واتە : ئایە ئێوە فەرمانی چاکە بەخەڵك دەکەن و کەچـی خۆتـان لـەبیر دەکـەن و وە خۆشتان خەریکی خوێندنەوەی کتێبن و خوێنەواریـشن ، بـۆ چـی ژیـر نـابن و هـۆش ناکەنەوە.

وەهەروەها خودای بەرز و بڵند دەفـەرموێت : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الصف: ٢ : ٣

[16] انظر (( الموافقات )) للشاطبي (١: ٦٠-٦٥ ) .

واته : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێن کەچی کردار و ڕەفتاری پێناکەن {٢} زۆر مایەی ڕق و توڕەییە لای خودا شتێك بڵێن و کاری پێ نەکەن .

وە خوای گەورە سەبارەت بە شوعەیب پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەگێڕتەوە کە فەرموویەتی بە گەلەکەی : ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾﴾ هود: ٨٨

واته : نامەوێت پێچەوانەتان بم لەشتێکدا کە لێتان قەدەغە بکەم ، وە هیچ ویستێکیشم نیە جگە لە چاکسازی نەبێت بۆ ئێوە ئەوەندەی بتوانم ، وە تەوفیق و دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست و ڕێنمویم تەنها بەخودایە ، پشتم بەو بەستووە و وەهەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە .

وە جگە لەمانەش چەند دەقێکی تر هەیە کە هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسانەی کە کار بەزانستەکەیان ناکەن .

وە بێگومان لە سەلەف و پێشینەمانەوە چەند وتەیەکی زۆرو بەنرخ هاتووە ، کە زۆر گەورە و بە پێزن زانایان لە کتێبەکانیاندا هێناویانە [١٧] .

شەیخ لإسلام ابن تەیمیە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرمویەتی :ــ (( .... هەر لەبەر ئەمەیە وتراوە : زانست دوو جۆر زانستە : زانستێك کە لەدڵدایە ، وە زانستێك کە لەسەر زمانە ، جا زانستی دڵ زانستێکی بەسوودە ، وە زانستی زمان ئەوە بەڵگەی پەروەردگارە بەسەر بەندەکانیەوە )) [١٨] ... جا ئەو زانایەی کە دڵی تێدەگات جیاوازە لەو ووتار بێژەی کە تەنها بە زمانی دەری دەبڕێت ، جاری وا هەیە بۆدڵ یەتەجێ لەتێگەشتن و زانست چەند کارێکی گەورە ، کەچی خاوەنەکەی ناتوانێت دەری بڕێت

[١٧] انظر بعضها في رسالة الخطيب البغدادي ( اقتضاء العلم العمل ) و رسالة الحافظ ابن عساكر ( ذم من لايعمل بعلمه ) وكلاهما مطبوع .

[١٨] ئەمە لە وتەی حەسەنی بەصریە ڕەحمەتی خوای لێبێت ، و أخرجه الدارمي ( ١٠٢،١ ) وغيره ، وذكره شيخ الإسلام في ( الفتاوى ) وعزاه للحسن . انظر ( ٧، ٢٣ ) .

بۆ غەیری خۆی ، وەجاری واش هەیە دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵ غەیری خۆیدا بەچەند کار و فرمانێکی زۆر لە شتە ناسراوەکانی دڵ حاڵەکانی ، کەچی خۆشی ڕووتە لەو باس و خواستانە ، وە چۆڵ و بەتاڵە لێی )) [19] .

بەوانەی کەڕابورد جێگەو گەورەی زانست دەناسرێت ، وە گەورەیی سوود دەرئەنجامەکانی ، وە بەهێزی شوێنەواری لەسەر بەهێزی باوەڕ و دامەزراوێتیکەی ، وە زانست گەورەترین هۆکارەکانی زیاد بوون و نشەو نماو بەهێز بوونی باوەڕە ، ئەمەش بۆ کەسێك کە کردەوەی پێبکات ، بەڵکو بێگومان کردەوەکان جیاوەزن لە کەم و زۆریاندا و وەرگرتن و گێڕانەوەیان لەڕوانگەی بێجیاوازی و بەرامبەریان لەگەڵ زانستدا ، هەروەك زانای پایە بەرز ابن قیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ((کردەوکان لەڕوی وەرگرتن و وەرنەگرتنیان بۆسەر خاوەنەکانیان بەگوێرەی موافەقەیەتی بۆ زانست و سەرپێچیەتی بۆی ، جا کردەوەی گونجاو و موافق بە زانست ئەوە قبوڵ کراوە ، وە کردەوەی پێچەوانە بەزانست ئەوە دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا ، کەواتە زانست تەرازوو پێوانەیە )) [20] .

وەهەر ابن قیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : (( هەموو زانست و کردەوەیەك ئیمان پێی زیاتر بەهێز نەبێت ئەوا خراپ و لەکەدارە )) [21] .

وە دەستگیربوونی باوەڕی زیادە لەڕوی زانستەوە لەچەند ڕویەکەوە دەبێت [22]:

١ـ لەڕوی دەرچوونی خاوەنەکەیەوە بۆ داواکردنی زانست .

٢ـ وە دانیشتنیان لەکۆڕی ذکر و یادی خوای پەروەردگاردا .

٣ـ وە یاد خستنەوەی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان لە بابەتە زانستێکاندا .

٤ـ وە زیاتر ناسینیان بۆ خوای پەروەردگارو شەرعی خودا .

٥ـ وە جێبەجێکردنی ئەوەی کە فێری بوون .

---

[19] (( درء التعارض )) ( ٤٥٣،٧،٤٥٤ )

[20] (( مفتاح دار السعادة )) ( ص : ٨٩ ) .

[21] (( الفوائد )) ( ١٦٢ ) .

[22] وەرگێڕ کردوویەتی بەخاڵ .

٦ـ وە هەرکەسێك لەوانەوە فێری زانست ببێت ئەوا بۆ ئەوان پاداشتی تێدایە .
ئەمە چەند لایەنێکە کە باوەڕ پێی زیاد دەکات بەهۆی زانست و دەستگیربوونیەوە .
بەڵام بەشەکانی زانستی شەرعی کە زیادبوونی باوەڕ بەهۆیەوە دەستگیر دەبێت زۆرن هەندێکی لەمانەی لەمەولا دێن باسدەکەم :

یەکەم:-

## خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و بیرلێکردنەوەی

بێگومان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و بیرلێکردنەوەی لەگەورەترین دەرگاکانی بەخشندەی زانستە بۆ زیاد بوونی باوەڕ و دامەزراندنی و بەهێزبوونی ، بێگومان خوای گەورە دایبەزاندووە کتێبە ڕۆشنەکەی بۆسەر بەندەکانی تابیبێتە ڕێنیشاندەر و ڕەحمەت و نور و ڕۆشنایی و مژدەدەر و یادخەرەوەی یاد کەران .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴿٩٢﴾ ﴾ الأنعام: ٩٢

واتە : ئەم قورئانەی بۆمان دابەزاندوویت کتێبێکی پیرۆزە وە بەڕاست دانەری کتێبەکانی پێش خۆشیەتی وەك { تەورات و ئینجیل } .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ ﴾ الأنعام: ١٥٥

واتە : ئەم قورئانەی بۆمان دابەزاندوویت کتێبێکی پیرۆزە وە شوێنی بکەون و بیکەن بەپێشەوای خۆتان وە خۆپارێزبن لەتاوان بەشکو ڕەحمتان پێبکرێت .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأعراف: ٥٢

واتە : بێگومان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرەکانماندا نامەیەکی وامان بۆ هێناون کەزانست و زانیاری و ڕاست و ناڕاستیمان تێدا ڕوونکردۆتەوە وە ڕێنمایی و بەسۆز و میهرەبانە بۆ گەلێك کە باوەڕبێنن .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ النحل: ٨٩

واتە : ئەم قورئانەمان دابەزاندە سەرت ئەی پێغەمبەر ﷺ تاهەموو شتێك ڕوون بکاتەوە وە ببێتە ڕێنمایی و میهرەبانی و مژدەدەر بۆ موسوڵمانان .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص: ٢٩

واتە : کتێبێکی پیرۆزمان بۆ دابەزاندوی ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی لەئایەتەکانی ڕابمێنن و بیری لێبکەنەوە وە ژیرەکان و خاوەن هۆشەکان ئامۆژگاری لێوەربگرن و یادی بکەنەوە .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الإسراء: ٩

واتە : بێگومان ئەم قورئانە ڕێنموی و ڕێنیشاندەرە بۆ بەهێزترین و ڕاسترین ڕێگا وە مژدەدەرە بەوئیماندارانەی کە کردەوەی چاك دەکەن کە بەڕاستی پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء: ٨٢

واتە : ئێمە دایدەبەزێنین لەم قورئانەدا چەند ئایەتێك کە مایەی شیفاو چاکبوونەوەیە لە نەخۆشی گومڕایی و نەفامی و وە شفای جەستەی ، وە لەگەڵ ئەمەشدا هیچ شتێك بۆ

ستەمکاران خوانەناسان زیاد ناکات جگە لە خەسارەت و زیان نەبێت ، چونکە ئـەوان خۆیان ئامادەی سوود لێوەرگرتن نین لێی .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٧

واتە : بێگومان لەو باس و سەرگوزشتەی ئەو پێشینانانەدا ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ ئـەو کەسەی کە دڵێکی زیندوو و ژیری هەبێت یاخود گوێی بەباشی لێبگرێت وە ئامادەش بێت کە گوێ و دڵی باتێ .

جا ئەم ئایەتانە گەورەیی قورئانی پیرۆزی تێدایە کە کتێبی پەروەردگاری جیهانیانە ، وە خوای گەورە پیرۆزی کردووە و کردویەتی بەرێنیشاندەر بۆ جیهـان ، وە کردویەتـی بـە شیفا بۆ نەخۆشییەکان بەتایبەتی نەخۆشییەکانی دڵ جـا چ نەخۆشـی گومـان بێـت یـان نەخۆشی ئارەزوو هەوەس بێت ، وە گێڕاوێتی بە مـژدەدەر بـۆ بـاوەڕداران وە سـۆز و میهرەبانی بۆ جیهان وە یادخەرەوە بۆ یاد کەران ، وە گێڕاوێتی بە بەهێزترین و ڕاسترین ڕێگا ، وە تێدا باس کردووە چەند بەڵگە لەگەڵ چەند هەڕەشەیەك بۆ ئەوەی مرۆڤەکان خۆیان لە تاوان بپارێزن یاخود یادی خودا بکەن .

جا ئەوکەسەی کە قورئـان دەخوێنێتـەوە وە لـە ئایەتـەکانی بیردەکاتـەوەو لێـی وورد دەبێتەوە ئەوا تێدا دەستی دەکەوێت چەندین زانست و ڕێگە نیشاندەر کە باوەڕی پێـی پتەو ببێـت و وەزیـاد بکـات و نـشە و نمـا بکـات پێـی ، چـونکە بـەو خوێندنـەوە و بیرکردنەوەیە لە گوفتاری قورئان خاوەن موڵکێکی دەست دەکەوێت کە هەموو موڵك هی ئەوە ، وە هەموو سوپاسێك هەر بۆ ئـەوە ، گـرێ کردنـەوەی هـەموو کارەکـان بەدەست ئەوە ، لای ئەوەوە هاتووە گەڕانەوەشی هەر بۆلای ئـەوە ، لەسـەر عەرشـی خۆی وەستاوە ، هیچ نهێنییەکی لێ وون نابێت لە کون و قوژبنی موڵکەکەیدا ، زانایە بەوەی کـە لـە نـاخی هـەموو بەنداکانیایـەتی ، وە بەئاگایـە بەسـەر هـەموو نهـێنی و ئاشـکراکانیان ، تەنهایــە لــە بــەڕێوەبردنی موڵکەکەیـدا ، دەبیـستێ و دەبینێـت ،

دەبەخشێت و دەگرێتەوە ، پاداشت دەداتەوە و تۆڵە و سزاش دەسەنێت ، ڕێز دەگرێت و خەڵکیش کەم نرخ دەکات ( کاتێك خەڵك کەم نرخ دەکات کە ئەو کەسە خوّی خراپەکار و سنوور بەزێن بێت . وەرگێڕ ) ، درووست دەکات و ڕۆزیش دەدات ، دەمرێنێت و دەشژیەنێت ، قەزاو قەدەر دادەنێت و کارەکانیش بەڕێوە دەبات ، وە بەندەکانیشی بانگ دەکات و ڕێگەی خۆش گوزەرانی و سەر فرازیشیان نیشان دەدات، وە هانیان دەدات بۆ ئەو ڕێگایە ، وە ئاگاداریشیان دەکاتەوە لەوەی کە لەناوچوونی ئەوانی تێدایە ، وە خۆشی پێیان دەناسێنێت بەناو و سیفەتە جوان بەرزەکانی ، وە خۆشەویستی خۆی دەردەخات بۆیان بە ناز و نیعمەتەکانی ، وە یادی ناز و نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بیریان ، وە فەرمانیان پێدەکات بەوەی کە ناز و نیعمەتەکانی بەتەواوی برژێت بەسەریاندا ، وە ئاگاداریان دەکاتەوە لە پاداشت دانەوەیەن بە سزا ، وە یادیان دەخاتەوە لەوەی کەبۆیانی ئامادە کردووە لەڕێز ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن ، وە لەوەی کەبۆی ئامادە کردوون لە سزا ئەگەر سەرپێچی بکەن ، وە هەواڵی داوە پێیان بەکارەکانی دەرهەق خۆشەویستان و دوژمنەکانی ، جا چۆنە دوارۆژی ئەو دوو گرۆیە . ( واتە : چاکە خوازان و خراپە کاران . وەرگێڕ ) .

وە وەصفی خۆشەویستانی دەکات بە کردەوە چاکەکانیان ، وە بەجوانترینی صیفاتەکانیان ، وە بەخراپە باسی دوژمنانی دەکات بە خراپی کارەکانیان ، وە ناشرین ترینی صیفاتەکانیان ، وە نموونەش دەهێنێتەوە بۆ هەردوو لایەنەکە ، بەچەندین بەڵگەی جۆراو جۆر ، وە وەڵامی گومانی دوژمنانی دەداتەوە بەجوانترین وەڵام ، ڕاستگۆ بەڕاست دادەنێت پشتگیریشی دەکات وە درۆزنیش بەدرۆزن دادەنێت و پشتگیریشی ناکات ، وە چی ڕاست بێت ئەوە دەفەرموێت ، وە ڕێنوی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست ، وە بانگەشە دەکات بۆ ماڵی سەلامەتی کە بەهەشتە ، وە باسی صیفەتەکانی و جوانییەکەی و ناز و نیعمەتەکانی دەکات ، وە ئاگاداریش دەدات لە ماڵی خراپە کە دۆزەخە وە باسی ئەشکەنجەکەی و ناخۆشی و ئێشەکانیشی دەکات ، وە بیری

بەندەکانی دەخاتەوە کەلەهەموو ڕوانگەیەکەوە زۆر پێویستیانەو ئیحتیاجی لای ئەون ، وە ئەوان دەوڵەمەند نین بەئەندازەی چاو تروکاندنێك بەبێ ئەو ، وە بێ پێویستی خۆی دەردەخات بۆ بەندەکانی و کۆی بوونەوەر وە خودای گەورە خۆی بۆ خۆی دەوڵەمەندە بەبێ کۆمەکی هیچ کەسێك ، وە هەموو بوونەوەرێك هەژاری لای ئەوە ، وەهیچ کەسێك بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك و سەرو ئەویش خێری پێناگات بە میهرەبانی و فەزڵی ئەو نەبێت ، وە هیچ کەسێك نارەحەتی پێناگات بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك و سەرو ئەویش بە دادوەری و دانایی ئەو نەبێت .

وەهەر لەوتەکانیدا سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنی دەبیرنرێت بەرامبەر خۆشەویستانی بەنەرمترین ڕەخنە ، (واتە کاتێك ڕەخنە لە خۆشەویستانی دەگرێت بە شێوەیەکی نەرم ڕەخنەیان لێدەگرێت وەرگێڕ) ، وە خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەو خزانەکانیان دادەپۆشێت ، وە لەپێخلیسکانەکانیان خۆش دەبێت ، وە عوزرەکانیان وەردەگرێت ، وە چاکەکاری خراپەکانیانە و بەرگریشیان لێدەکات و سەرخەر و پارێزگارێیانە وە لەخۆگری چاکەکانیانە و دەربازکەریانە لە لەهەموو نارەحەتییەك و بەجێهێنەری پەیمانێتی وە ئەو سەرپەرشتکاریانە بێجگە لەو سەرپەرشتکاریان نییە ، وە خوای گەورە گەورەی ڕاستییانە و سەرخەریانە بەسەر دوژمنانیان ، جاکەوابوو ئەوە چاکترینی سەرپەرشتکار و سەرخەرە .

جا بەندە هەمیشە لەسوود و قازانجدا دەبێت ئالەم بیرکردنەوەیە لە کتێبی خوای گەورە وە دڵی ئامادەی ئەو بیرکردنەوەیە دەبێت بەزانست وە باوەڕیشی پێی زیاد دەکات و بەهێزیش دەبێت ، جا چۆن ئەوە نابێت ؟ کەئەو لە قورئاندا پادشایەکی گەورەی میهرەبانی سەخی جوانی دەست دەکەوێت جا پادشایەك ئەوە وەصفی بێت چۆن خۆشی ناوێت و پێشبڕکێ ناکات بۆ نزیکبوونەوە بەرەولای ، وە هەناسەکانی نابەخشێت لە بۆ خۆشەویستی ئەو ، چۆن نابێت بەخۆشەویسترین لەلای بەجۆرێك لەو خۆشەویستر نەبێت لەلای ، چۆن ڕەزامەندی ئەو کاری تێناکات بەسەر ڕەزامەندی هەرکەسێکدا جگە لە خودای گەورە ، چۆن هۆگری یادکردنی نابێت وە خۆشەویستێکەی و

ڕۆشنایيەکەی و ئارامی بەو نابێت بە ڕۆزی و هێز و شیفا ، بەشێوازێك ئەگەر ئەو خۆشەویستی و ئارامی و ڕۆشناییە لەدەست بدات خراپ بێت و لەناوبچێت وە سوود لە ژیانی نابینێت [23] .

وە ئاجوری ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : (( هەرکەسێك بیر لەوتەکانی خودا بکاتەوە ئەوا خودای بالادەست دەناسێت ، وە گەورەیی مولك و دەسەلاتەکەشی دەناسێت ، وە گەورەیی فەزڵیشی دەناسێت بەسەر ئیمانداراندوە ، وە دەزانێت چی لەسەرە لە پێویستی بەندایەتی خودا ، وە نەفسی خۆی بەردەوام دەکات لەسەر واجبەکان ، وە خۆشی دەپارێزێت لەوەی کەخودای گەورە ئاگادارکردۆتەوە لێی ، وە ئەوەی پێخۆشە کە خودای گەورە پێی خۆشە ، وە هەرکەسێك ئائەمە صیفەتی بێت لەکاتی خوێندنەوەی بۆ قورئان وە کاتی گوێگرتنیشی جگە لەخۆی ئەوا قورئان بۆی شیفایە وە دەوڵەمەندیشە بەبێ ماڵ ، وە سەربەرزە بەبێ هۆز و عەشرەت ، وە ئاسوودە و ئارام دەبێت لەوەی کە خەڵك لێی دەتۆقێت و بێتاقەت دەبێت ، وە هەموو هەم و پەژارەیەکی لەکاتی قورئان خوێندندا کاتێك کە دەست دەکات بەخوێندنی سوورەتێك ئەوەیە کەی پەند و ئامۆژگاری وەربگرم بەوەی کەدەیخوێنم ؟ وە ویستی ئەوە نییە کەی ئەم سوورەتە تەواو بکەم ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەقڵم بشکێت بە گوفتاری خودا بەرامبەرمان؟ وەکەی بمگێڕێتەوە لەتاوان؟ وەکەی پەند وەربگرم ؟ چونکە قورئان خوێندن بەندایەتییە ، نابێت بەبێ ئاگایی بێت ، وە خوداش تەوفیق دەرە بۆ ئەوە )) [24] .

هەرلەبەر ئەوەیە کە خوای بەخشندە فەرمان دەکات بەبەندەکانی و هانیان دەدات بۆ بیرکردنەوە لەقورئان دەفەرموێت : ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء: ٨٢

واتە : ئایە ئەو دووڕووانە بیرناکەنەوە لە مانا و واتا و مەبەستی قورئان خۆ ئەگەر لەغەیری خوداوە بووایە ئەوا جیاوازی و شێواوییەکی زۆریان تێدا دەست دەکەوت .

---

[23] انظر (( الفوائد )) لابن القيم ( ص ٥٨،٦٠ )

[24] (( أخلاق حملة القرآن )) للآجري ( ص: ١٠ ) .

وه دەفەرموێت : ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ محمد: ٢٤

واتە : ئایە ئەو دووڕوو بێباوەڕانە بۆ بیرناکەنەوە و ڕانامێنێن لە قورئان ؟ بەڵکو قوفڵ لەسەر دڵیان دراوەو هیچ خێرێکی تێناچێت ، بۆیە ئاوا گومڕاو سەرگەردان بوون .

وە خوای گەورە هەواڵی داوە کەئەم قورئانەی بۆ بیرکردنەوە لەئایەتەکانی دابەزاندووە، دەفەرموێت : ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص: ٢٩

واتە : کتێبێکی پیرۆزمان بۆ دابەزاندوی ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی لەئایەتەکانی ڕابمێنن و بیری لێبکەنەوە وە ژیرەکان و خاوەن هۆشەکان ئامۆژگاری لێوەربگرن و یادی بکەنەوە .

وە خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە هۆکاری نەبوونی هیدایەت بۆ ئەوکەسانەی کەگومڕابوونی لەڕێگەی ئیسلام ، ئەوە وازهێنانیانە لە بیرکردنەوە لە قورئان و خۆبەزل زانینیان لەگوێگرتن لێی ، بۆیە دەفەرموێت : ﴿ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ المؤمنون: ٦٦ : ٦٧: ٦٨ .

واتە : بەڕاستی کاتێك ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێندرایەوە ئێوە پاشەوپاش دەگەڕانەوە دواوە ﴿٦٦﴾ لەبەرامبەریشیدا خۆتان زۆر بەزل دەزانی و بەدرێژایی شەوگاریش دادەنیشتن قسەی خراپتان دەربارەی قورئان و ئەم پەیامە و پێغەمبەر ﷺ دەکرد ﴿٦٧﴾ ئاخۆ ئەوان بیرناکەنەوەلەم گوفتارە ( واتە : قورئان ) تابەهۆیەوە بزانن کتێبێکی چەند بەسوودو پڕبایەخ و پڕلەموعجیزەیە یاخود ئەم بانگەوازەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە نامۆیە بەبانگەوازی پێغەمبەرانی پێشوو کە باو و باپیریان پێیان گەشتووە؟ واتە : ئەو بانگەوازەشی کە پێغەمبەر ﷺ هاتبوو پێی بۆ ناویان هەر هاوچەشنی بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشووە کەبە باو و باپیریان نامۆ نەبوو﴿٦٨﴾ .

وه خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی قورئان کە باوەڕی بڕواداران زیاد دەکات کاتێك بیخوێندنەوە و بیر لەئایەتەکانی بکەنەوە ، دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ﴾ الأنفال: ٢

واتە : باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەوانەن هەر کەناوی خودا هێنرا دڵیان لەبەر گەورەیی خودا دەکەوێتە لەرزەو ترسی لێدەنیشێت ، هەرکەئایەتەکانیشی بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە باوەڕیان زیاد دەبێت هەربەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن .

وه خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی مرۆڤە چاکەکانی ئەهلی کتاب کەکاتێك قورئان بخوێندرایەتەوە بەسەریاندا یەکسەر کڕنوشیان دەبردوو دەگریان و ملکەچی باوەڕ و تەسلیم بوونیان زیادی دەکرد ، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت :

﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ۝١٠٧ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ۝١٠٨ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۝١٠٩ ﴾ الإسراء: ١٠٧ : ١٠٨ : ١٠٩ .

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو بێباوەڕانە بڵێ باوەڕ بەو قورئانە بێنن یاخود باوەڕی پێنەهێنن بایەخ و بەهای کەم ناکات وەك خۆی دەمێنێتەوە ، بەڕاستی ئەوانەی لەپێش ئەم قورئانەوە زانست و زانیارییان پێدراوە ( خاوەن کتێبەکان و پیاو چاکەکانیان دەزانن کەئەم قورئانە لەهەمان سەرچاوەوە هاتووە کە کتێبەکانی ئەوانی لێوە هاتووە ) هەرکات بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە بەڕوودا دەکەونە سەر زەوی بۆ کڕنووش بردن سوپاسی خوا دەکەن ﴿١٠٧﴾ وەدەڵێن پاکی و خاوێنی هەر شایستەی پەروەردگاری ئێمەیە وە بێگومان بەڵێنی پەروەردگارمان لەکاتی خۆیدا هاتۆتە دی کەلەو کتێبانەدا بۆ ئێمە هاتبوو ئەوا ئەمڕۆ ئەو مژدەیە هاتە دی ( کە هاتنی پێغەمبەرخوا بوو ﷺ ) ﴿١٠٨﴾ وە بۆ سوپاسی خودا بەڕوودا دەکەونە سەر زەوی بۆ کڕنووش بردن ، وە

لەترسی خودا بەکوڵ دەگرین و فرمێسك دەڕژن ، وە جار لەدوای جار ئەو قورئانە ملکەچیان زیاد دەکات ﴿١٠٩﴾ .

وە خوای گەورە هەواڵی داوە ئەگەر ئەم قورئانەی دابەزاندایەتە سەر کێوێك ئەوا ملکەچ دەبوو وە پەرت پەرت دەبوو لەترسی خودای باڵادەست ، وە ئەمەشی کردووە بەوێنە بۆ خەڵك و ڕوونیشی کردۆتەوە بۆیان گەورەیی ئەم قورئانە ، هەر بۆیە فەرمویەتی : ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الحشر: ٢١

واتە : ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایەتە سەر کێوێك ئەوا دەتبینی بەملکەچ و پەرت پەرت بوویی لەترسی خوا کەوابوو ئەی ئێوەی ئادەمیزاد بیربکەنەوەو لەخودا بترسن و قورئان بکەنە بەرنامەی خۆتان وەئێمە ئەم نموونانە لەقورئاندا بەچەند وێنە و شێوەیەك دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بەڵکو بیربکەنەوەو تێبگەن .

وە خوای گەورە وەصفی قورئانی کردووە کە جوانترین وتەیە وە خوای گەورە چەند ئایەتێکی هاوواتایی تێدا دووبارە کردۆتەوە بۆئەوەی بەهۆیەوە لێی تێبگەن ، وە بێگومان پێستی پایەبەرزەکان لە دیندا کرژ دەبێت لەکاتی بیستنی قورئاندا لەترسدا ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزمر: ٢٣

واتە : خوای گەورە جوانترین و چاکترین قسە و فەرموودەی دابەزاندووە ( ئەویش ئەم قورئانەیە بۆئەوەی پەیڕەو بکرێت ) کتێبێکی وەك یەك چووە ( واتە : لەڕووی قەشەنگی و ڕەوانبێژییەوە لەیەك دەچێت ) پەند و ئامۆژگاری و فەرمان بەحەڵاڵ و حەرام و چاکە و خراپە و چیرۆکەکان چەند جار تێیدا دووپات بۆتەوە ، لەبیستنی هەڕەشەکانیدا ئەوانەی کەلەپەروەردگاریان دەترسن پێستیان گرژ دەبێت پاشان پێستیان

ـِ دڵیان بۆ ذکر و یادی خودا نەرم دەبێت ، ئەم قورئانەیە ڕێنمویی خودا هەرکەسێك خودا بیەوێت پێی شارەزا دەکات و ڕێنمویی دەکات ، وە هەرکەسێکیش خودا گومڕای بکات بەهۆی لاساری خۆیەوە ئەوا کەسی ترنییە ڕێنمونی بکات .

ـِوە خوای گەورە ڕەخنە لەئیمانداران دەگرێت لەسەر نەبوونی ملکەچییان لەکاتی گوێ گرتنیان لەقورئان ، وەئاگاداریان دەکاتەوە لەچوونیەکییان لەبێباوەڕەکان لەو نەبوونی ملکەچیەدا لەکاتی گوێ گرتن لەقورئان ، هەربۆیە دەفەرموێت : ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ (١٦) ﴾ الحديد: ١٦

واتە : ئایە کاتی ئەوە نزیك نەبۆتەوە بۆئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە کەدڵەکانیان نەرم و ملکەچ ببێت بۆ یادی خودا ، بۆئەوی دابەزیوە لەهەق و ڕاستی ، وە وەك ئەوانەنەبن کەکتێبیان پێبەخشرابوو لەپێشەوە ، لەجوولەکە و گاور ، جازۆریان بەسەردا تێپەڕی بۆیە دڵیان ڕەق بوو ، وەزۆربەشیان لەفەرمان و گوێڕایەڵی فەرمانی خودا دەرچوون .

جا ئەم ئایەتانەی پێشەوە کە باسکرا ڕوون ترین بەڵگەی تێدایە لەسەر گەورەیی قورئان و پابەند بوونی گوێدان پێی وەلەسەر بەهێزی ئەو کاریگەرییەی کەلەسەر دڵەکان هەیەتی وەقورئان گەورەترین هۆکاری زیاد بوونی باوەڕە ، بەتایبەتی کاتێك خوێندنەوەکەی بە بیرلێکردنەوە و هەوڵدان بۆ تێگەشتنی واتاکانی بێت .

وە ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بەگشتی هیچ شتێك نییە سوود بەخش تر بێت بۆ دڵ لەخوێندنەوەی قورئان و بیرلێکردنەوەی ، چونکە خوێندنەوەی قورئان و بیرلێکردنەوەی کۆی هەموو کۆکانە بۆ ئەوکەسانەی ئیسلام دەکەنە پێگەی خۆیان وە بۆ حاڵی کارکەرانی ئیسلام و پێگەو پلە و پایەی خواناسان ، چونکە هەر خوێندنەوەی قورئان و بیرلێکردنەوەیەتی خۆشەویستی و ڕۆشنایی و ترسان لەخوداو تکاو گەڕانەوە بۆلای و پشت بەستن بەوو ڕەزامەندی و خۆدانە دەست ئەوو سوپاس و ئارام گری و ، وە باقی حاڵەکانی تر کەژیانی دڵ و تەواوی دڵی پێ یەتەجێ بەمیرات

دەگرێت ، وەهەروەها هەر خوێندنەوەی قورئان و بیرلێکردنەوەیەتی مرۆڤـەکان دوور دەخاتەوە لـە کۆی ئاکار و کارە ناشرین و قێزەونەکان کەبەهۆیانەوە دڵ خراپ دەبێت و لـەناو دەچێت ، جائەگەر خەڵکی بیان زانیایە چی هەیە لـە خوێندنـەوەی قورئـان بـە بیرلێکردنەوەی ئەوا بەس خەریکی خوێندنەوەی قورئان دەبوون و جگـە لـەقورئان بـە هیچی ترەوە خۆیـان سـەرقاڵ نـەدەکرد ، وەکاتێـك قورئـانی خوێنـدەوە بـەتێڕامان و بیرلێکردنەوەوەو ڕۆی بەسەر ئایەتێکدا ئـەو پێویـستی بـوو بـۆ شـیفا ئـەوا دووبـارەی دەکاتەوە ئەگەر سەد جاریش بێت و لـەیەك شەویشدا بێت ، جا خوێندنەوەی ئایـەتێك بەتێڕامان و بیرلێکردنەوەو تێگەشتنەوە خێرترە لـە خوێندنەوەی تـەواوی قورئـان بـەبێ تێڕامـان و بیرلێکردنـەوەو تێگەشـتنەوە ، بـەڵام خوێندنـەوەی قورئـان بـەتێڕامان و بیرلێکردنەوەوە سوود بەخش ترە بۆ دڵ وە زیاتر لـەو داخوازیانەیە بۆ بەدەست هێنـانی باوەڕ و چەشتنی شیرینی قورئان ... )) [٢٥] .

وە شیخ محمد رشید رضا (ڕەحمەتی خوای لێبێـت) دەفـەرموێت : بزانـە بێگومـان هێـز و پتەوی دین و تەواوی باوەڕ و یەقین نایەنە جـێ بـەزۆر خوێندنـەوەی قورئـان و گـوێ لێگرتنی نەبێت لـەگـەڵ بیرلێکردنـەوەی نـەبێت بەویـستی شـوێن کـەوتنی و کـردەوە بەفەرمانی و دوورکەوتنەوە لـە قەدەغەکانی ، جـا بـاوەڕێکی ڕاسـت و ملکـەچ زیـاد دەکات و بەهێز دەبێت و نشە و نما دەکات وەڕەنگدانەوە تیایدا دێتە جێ بـەکردەوەی چاك و وازهێنان لـە تاوان و خراپە بەئەندازەی بیرکردنەوە لـە قورئان ، وەکەم دەکـات و لاواز دەبێت بەو ئەندازەیەی کەزیاد دەکـات بـەواز هێنـان لـەبیرلێکردنـەوەی ، وە زۆربەی عەرەب باوەڕیان نەهێنا جگە بەگوێ لێگرتن و تێگەشتنی نەبێت وە فەتحی هیچ شارێکیان نەکردوو وە هـیچ دەوڵـەتێکیان دانەمەزرانـد و هـیچ بینایـەکیان بـۆ بـەرز نەکرایەوە و دەسەڵاتیان گەورە و فـراوان نـەبوو بەکاریگـەری ڕێنماییـەکانی قورئـان نەبێت ، وە ڕێگر و مل هوڕەکان لـە گەورە پیاوانی مەککە دژایەتی پێغەمبەریان ﷺ

---

[٢٥] (( مفتاح دار السعادة )) ( ص : ٢٠٤ )

نـەدەكردوو ڕێگـری پەیامەكـەی خودایـان لێنـەدەگرد جگـە بـە ڕێگـری كردنـی خوێندنەوەی قورئان نەبێت بەسـەر خەڵكـدا ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ فصلت: ٢٦ واتە : بێباوەڕەكان بەیەكتریيان دەوت گوێ بۆئەو قورئانە مەگرن و بیكەنە غەڵبە غەڵب و هەرا و هۆسە بەڵكو زاڵ ببن بەسەر موحەمەددا ﷺ ، وە ئیسلام لاواز نەبوو لەناخی هەنێك لـە خەڵكانیّ لەناوەڕاستی سەدەكانی ناوەڕاستەوە هەتا زۆربەی موڵك و دەسەڵاتی لەدەست بدات ، بەبۆنەی پشتكردن نەبێت لە بیكردنەوەی قورئان و خوێندنەوەی و كاركردن پێی ) [٢٦] .

قورئانی پیرۆز لەگەورەترین بەهێزكەری باوەڕە ، وەسوود بەخشترین داخوازییە بۆ زیاد بوونی ، وە قورئان باوەڕی بەندە بەهێز دەكات لەچەند ڕوویەكی جیاوازەوە .

وە ابن سعدی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : قورئان باوەڕی بەنـدە بـەهێز دەكـات لەچەند ڕوویەكی جیاوازەوە ، جاباوەڕدار بەس بەوەی ئایەتەكانی خـودا دەخوێنێتـەوە وە ئەوانەی كە داڕێژراوە تێدا لە هەواڵە ڕاستەكان و حوكمە جوانەكان دەیان ناسێت لە لق و پۆپی باوەڕ خێرێكی زۆری بۆ دێتە جێ ، ئەی دەبێت حاڵی چۆن بێت كاتێـك بەجوانی بیری لێبكاتەوە ، وە تێبگات لە ویستەكانی و نهێنییەكانی ؟ ) [٢٧] .

بەڵام پێویستە بزانرێت كە زیاد بوونی باوەڕ كە بەخوێندنـەوەی قورئـان زیـاد دەكـات زیادبوون دروست نابێت تەنها بۆ كەسێك نەبێت كە گوێ بدات بە تێگەشتن لە قورئان وەجێبـەجێكردنی و كردەوەكـردن پێـی ، نـەك تـەنها بیخوێنێتـەوە بـێ تێگەیـشتن و بیرلێكردنەوەی ، ئەگەر وانەبێت حوكمی قورئان خوێن لەڕۆژی دواییدا قورئان دەبێت بە بەڵگە بۆی و وە لەدژیشی دەوەستێت .

چۆن قورئان دەبێت بە بەڵگە بۆی و وە لەدژیشی دەوەستێت لەڕۆژی دواییدا ؟

بەخوێندنەوەكەی دەبێت بەبەڵگە بۆی چونكە خوێندنەوەی قورئان عیبادەتە .

---

[٢٦] (( مختار تفسير المنار )) ( ٣:١٧٠ ) .

[٢٧] (( التوضيح و البيان لشجرة الإيمان )) ( ص: ٢٧ ) .

وه ئهگهر لێشی تێنهگات ئهوا قورئان دهڵێت خودایه ئهو خوێندمییهوه بهڵام لێم تێنهگهیشت . وهرگێڕ .

فَقَدْ ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : ( إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذا الكِتَابِ أَقْوَامَاً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ)[28] .

واته : جێگیر بووه له پێغهمبهرهوه ﷺ كه فهرمویهتی : ( بێگومان خوایی گهوره بهم كتێبه چهند گهلێك بهرز دهكاتهوه وه چهندینی كهشی پێ دادهبهزێنێت ) .

خوای گهوره كهچهند گهلێك دادهبهزێنێت واته كهم نرخیان دهكات ئهوا هۆكاری ئهوهیه كهخۆیان قبوڵی ههق ناكهن و وهری ناگرن جاههركهسێك خۆی ههق وهرنهگرێت ئهوا موستهحهقی كهم نرخییه . وهرگێڕ :-

وَ ثَبَتَ عَنْهُ ﷺ أَنَّهُ قَالَ : ( ... وَالقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيكَ ) [29] .

واته : ههر له پێغهمبهرهوه جێگیر بووه ﷺ كه فهرمویهتی : ( قورئان بهڵگهیه بۆ تۆ یاخود لهسهر تۆ ) .

بهڵگهیه بۆ تۆ واته : تكات بۆ دهكات لهڕۆژی دواییدا ، یان لهسهر تۆ واته: شكاتت لێدهكات . وهرگێڕ .

جائهگهر كاری پێبكهیت ئهوا باوهڕت زیاد دهكات و دهبێت بهبهڵگه بۆت ، وه ئهگهر كهم تهرخهمی تێدا بكهیت و گوێ نهدهیت بهسنوورهكانی ئهوا باوهڕت كهم دهكات و دهبێت بهبهڵگه لهسهرت .

قال قتادة رحمه الله تعالى :- ( لَـمْ يُجَالِسْ هَـذا القُـرْآنَ أَحَـدٌ إلاَّ قَـامَ عَنْـهُ بِزِيَـادَةٍ أَو نُقْصَانٍ)[30] .

وه قهتاده (ڕهحمهتی خوای لێبێت ) فهرمویهتی : ( ههیچ كهسێك لهگهڵ ئهم قورئانهدا دانانیشێت كاتێك ههستا لهلای (( قورئان )) باوهڕی یان زیاد دهكات یاخود كهم ) .

---

[28] رواه مسلم ( ١:٥٥٩ ) .
[29] رواه مسلم ( ١:٢٠٣ ) .
[30] رواه ابن المبارك في الزهد ( ص: ٢٧٢ ) والآجري في أخلاق حملة القرآن ( ص: ٧٣ ) والمروزي في قيام الليل ( ص: ٧٧ مختصرة ) وذكره البغوي في تفسيره ( ٣:١٣٣ ) .

ئەگەر بەبیرلێکردنەوەوە بیخوێنێت وە هەستێت بەجێبەجێکردنی ئەوانەی تیایدایە وە دوور بکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی ئەوا باوەڕی بەبێ گومان زیاد دەکات وە ئەگەر بەپێچەوانەشەوە بێت ئەوا باوەڕی کەم دەکات . وەرگێڕ : ـ

وە شێخ حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) واتای بیرلێکردنەوەی ڕوونکردۆتەوەو فەرمویەتی : ( سوێند بەخوا بەلەبەرکردنی پیتەکانی و فەرامۆش کردنی سنوورەکانی نابێت ، هەتا یەکێك بڵێت : بێگومان هەموو قورئانم خوێندەوە ، وە هیچ پیتێکم لێنەپەڕاند ، بەڵکو سوێند بەخودا هەمووی پەڕاندووە ، چونکە ئاکاری قورئان نەلەڕەوشتی و نەلە کردەوەیدا نابینرێت ، هەتا یەکێك بڵێت : بێگومان من بەیەك جار سورەتێك دەخوێنم ، سوێند بەخودا ئەو کۆمەڵە کەسانە نە قورئان خوێنن و نە زانان و نە دانان و نە ئەهلی وەرعن ، وە هەرکاتێك قورئان خوێنەکان وێنەی ئەمانەیان لێهات و ئەمەیان وت ! ئەوا خوای گەورە وێنەیان لەناو خەڵکدا زیاد نەکات )[٣١] .

شیخ عبدالرزاقي نووسەری ئەم کتێبەش ( خوادا لێی ببورێت ) دەفەرموێت : خودا ڕەحم بە شێخ حەسەنی بەصری بکات ، چی وای لەحەسەنی بەصری کردووە کەوا بڵێت ئەگەر هەندێك لە قورئان خوێنی ئەم سەردەمەی ئێمەی ببینیایە ! کەکەوتونەتە فیتنەوە بەجۆرەها ئاواز و دەربڕینی پیتەکان و زەوق پێدانی بەئارەزووی خۆیان قورئان دەخوێنن ، لەگەڵ گوێ پێنەدان و بەفیڕۆدانی سنوورەکانی ، بەڵکو وەك خۆشی قورئان بخوێنێت ئەوا ئەو خەڵکانەی ئامادەی گوێ گرتنن هەریەکەو داڵغە و هۆشی لەشوێنێکی ترە ، لەباتی بێدەنگ بوون و بیرکردنەوە لە وتەی خوای گەورە .

بەهەر حاڵ ڕکابەری و ڕەخنە نییە لەسەر جوان قورئان خوێندن و ئاواز بۆ دانانی و بەجوانی دەربڕینی ، بەڵکو ڕخنە لەسەر ئەوە هەیە کەبەناڕەحەتی پیتەکان دەربڕێت و هیچیان لەشوێنی خۆیدا دەرنەبڕێت ، بەبێ گوێدان بەهەستان بەو فەرمانانەی کەقورئان لە پێناویدا دابەزێندراوە ، هەتا تۆ نابینی لەهەندێك لەوانەی کەخۆیان بەئەهلی وەرع

---

[٣١] رواه عبدالرزاق في مصنفه ( ٣٦٣:٣ ) و ابن المبارك في الزهد ( ص: ٢٧٤ ) والآجري في أخلاق حملة القرآن ( ٤١ ) والمروزي في قيام الليل ( ص: ٧٦: مختصرة ) .

و جێ بەجێ کار بەسنووری خودا دەزانن ، لەگەڵ ئەوەشدا نایانبینی کە سنووری قورئان بپارێزن نەلە ڕەوشتیاندا وە نەلەکردەوەیاندا .

دەبینی قورئان خوێنێك لەوان قورئانی پیرۆزی بەتەواوی لەبەرە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕیشی پاك دەتاشێت و یاخود جلەکانی لەزەوی دەخشێت ، بەڵکو بەتەواوی گوێ بەنوێژ نادات یان لەگەڵ جەماعەتدا هەرگیز نایکات ، بێجگە لەمانەش چەندین کاری ناشرین وقێزەونی تر ، هەتا یەکێك لەوانە خوا یارمەتیمان با ، دەستپێکی ئاهەنگێکی گۆرانی ئافرەتێکی خراپەکاری بەچەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کردۆتەوە ، لەنێو گۆرانیەکانی ئەودا چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی خوێندووە ، وتەی پەروەردگاری ئێمە بەرزترە لەوەی ئەو کۆمەڵە چەپەڵە بیانەوێت پیسی بکەن ، وە بەسە منیش بڵێم هەروەك شێخ حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرمووی : هەرکاتێك قورئان خوێنەکان وێنەی ئەمانەیان لێهات و ئەمەیان وت ! ئەوا خوای گەورە وێنەیان لەناو خەڵکدا زیاد نەکات .

وە ابن العربی (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) وەصفی قورئان خوێنەکانی سەردەمی خۆی کردووە بەوەی کەخەریکی جوان خوێندنی بوون وەگوێیان بەسنوورەکانی نەداوە ، فەرموویەتی: دەستگرتنیان بەم کارەوە ( واتە : بەس باش خوێندنەوە بێ گوێڕایەڵی کردنی ) لەگەڵ ئەوەشدا قورئان بۆیە دابەزێندراوە بۆئەوەی کاری پێبکرێت ، وە پاشان فەرموویەتی : کاتێك قورئان خوێندن بوو بەم قورئان خوێندنە دەستیانکردە فڕین بەسەریداو پێشبڕکێکردن پیایدا ، وە تەمەنی خۆیان بەفیڕۆدا بەبێ هیچ پێویستییەکی ئەوان بۆ ئەوکارە ، جا یەکێك لەوان دەمرێت وە قورئانی خوێندووە هەروەك پەرداخ ڕیزدەکرێت ، بەڵام واتاکانی تێکشکاندووە وەك شکاندنی قاپ و قاچاغ ، بەجۆرێك واتای هیچیان بەیەکەوە ناگونجێت ) [٣٢] .

---

[٣٢] العواصم من القواصم ( ٢:٤٨٦ ) ضمن كتاب (( آراء أبي بكر بن العربي الكلامية )) لعمار الطالبي . وانظر ما كتبه الذهبي عن أمثال هؤلاء القراء في كتابه (( زغل العلم )) (ص: ٢٥-٢٧ ) وە دانەری کتێب دەفەرموێت : ئەگەر ترسی درێژێکەی نەبوایە هەموویم دەهێنا لەبەر گرنگێکەی .

وه ابن تیمیه ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) حاڵی خاوەن قوڕئان ڕوون دەكاتەوە كە دەگـات بـەو پلـە و جێگە بەرزە دەفەرموێت : قوڕئان خوێن بەردەوام بیردەكاتەوە لـە واتاكـانی ، وە تێڕادەمێنێت لـە وشەكانی ، وە دەوڵـەمەندە بەواتاكانی قوڕئان و حوكمەكانی لـە غەیری قورئان لـە وتەی خەڵك كاتێك گوێی لـە قـسە و زانـستی خـەڵكی دەبێـت بـەراوردی دەكات لـەگەڵ قورئان ، جا ئەگەر قوڕئان شاهیدی بەپاكی بۆدا ئـەوا وەری دەگرێـت وەئەگەر شایەتی بەپاكی بۆنەدا ئەوا ڕەتی دەكاتەوەو وەری ناگرێت ، وە ئەگەر قوڕئان شایەتی بە قبوڵ و ڕەت بۆ نەدا ئەوا دەیوەستێنێت ، وە تواناى ڕاوەستاوە لـەسەر ویسی پەروەردگاری لـەقسەكانیدا ، وەتواناى خۆی ناخاتە كار بۆئەو زانـستانەی كەزۆربـەی خەڵك پێوەی خەریكبوون دوور لـە قوڕئان ، یان لـەدوودڵـیدا بێت لـەدەربڕینی پیتەكانی لـە بچووك خوێندنەوەیان و گەورە خوێندنەوەیان و درێژكردنـەوە و دەربـڕینی مـەدی درێژ و كورت و ناوەندی ! وە جگە لـەمانەش ، ئائەمانە پەردەن بۆ دڵان وەپـچڕێنەری دڵانن لـە تێگەشتن لـەویستی خوای پەروەردگار ) [٣٣] .

وە پێویستە بۆ موسوڵمان پێش ئەوەی كە قوڕئـان بخوێنێـت خـۆی فێربكـات كەچـۆن سوودی لێوەربگرێت ، هەتا سوودی تەواوی لێوەربگرێت ، وە ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لــەم باســەدا بناغـە و بنـچینەیەكی گـەورە و زۆر بەسـوودی بـاس كـردووە ، دەفەرموێت : ( كاتێك ویستت سوود لـەقوڕئان وەربگریت ، دڵـت كۆبكەرەوە لـەكاتی خوێندنەوەی و بیستنیدا ، وە باش گوێی بۆبگرە ، وە ئامادەی بە ئامادەیی كەسێك كـە قسەی بەقوڕئان لـەگەڵدا بكرێت كێش قسەی پێبكات (( خودای گەورە )) لـەگەڵـیدا (( ئەو كەسەی دەیخوێنێت )) خودای پاك و بێگەرد) [٣٤] .

جاهـەر كەسـێك ئـەم یاسـایە جێبـەجێبكات وەلەسـەر ئـەم ڕێگایـە بـڕوات لــەكاتی خوێندنــەوەی بـۆ قوڕئـان یـاخود گـوێ گـرتنی بـۆی ئـەوا بەزانـست و كـردەوەوە

---

[٣٣] (( الفتاوى )) ( ١٦:٥٠ ) .
[٣٤] (( الفوائد )) ( ص: ٥ ) وانظر (( الفتاوى )) لابن التیمیة ( ١٦:٤٨،٥١ ) و ( ٧:٢٣٦،٢٣٧ ) .

سەردەکەوێت ، وە باوەڕیشی زیاد دەکات و دامەزراو دەبێت وەك دامـەزراوی کێـوە دامەزراوەکان . وە خودای گەورە لێپرسراوە کە تەوفیقمان بدات بۆ هەموو چاکەیەك.
پاشان بیرکردنەوە لـە ئایەتەکانی خودا دوو جۆرە : ( بیرکردنەوە لـە ئایەتـەکانی خـودا بۆ ئەوەی ویستی خوا لەوەدا بزانێت ، وە بیرکردنەوە لــە واتاکـانی ئـەوەی کـە خـوا بەنداکانی بۆ بانگ کردووە کە بیری تیادا بکەنـەوە ، جـا یەکـەمیان بیرکردنـەوە لــە بەڵگە قورئانییەکان ، دووەمیان بیرکردنەوە لە بەڵگە بینراوەکان ، یەکەم بیرکردنەوەیە لە ئایەتە بیستراوەکان ، دووەم بیرکردنەوەیە لـە ئایەتە بینراوەکانی پەروەردگار ) [٣٥] .
ئەمەش وتەی ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) .
منیش دەڵێم : ئەو قسانەی کە لێرەدا باسم کرد ئەوە سەبارەت بەبیرکردنەوە لـە ئایەتە بیستراوەکانی خودا ، بەڵام قسە کردن لـەسەر ئایەتە بینراوەکانی خودا بەم زووانە قسە کردن لـەسەری دێت إن شاء الله .

---

٢٩(( مفتاح دار السعادة )) ( ص: ٢٠٤ ) .

دووەم :-

## ناسینی ناوەجوانەکانی خوای گەورەو صیفاتە بەرزەکانی

بێگومان ناسینی ناو و صییفەتەکانی خوای گەورە کە هاتووە لە قورئـان و سـونەتدا ، ئەوانەی کـە بەڵگـەن لەسـەر بـێ کـەم کـورتی خـوای گـەورە بـەرزەهایی لەهـەموو ڕوویەکەوە ، لەگەورەترین دەرگاکانی زانستە کە باوەڕ پێی زیاد ببێت ، جا خۆخەریك کردن بەناسینی ناو و صیفەتەکانی خوای گـەورەوە وە تێگەشـتن و گـەڕان بەدوایانـدا چەند سوودێکی زۆر و گەورە لەخۆ دەگرێت ، لەوانە :

١ـ بێگومان زانـستی یەکتاپەرسـتی و نـاو وصـیفەتەکان شـکۆدارترینی زانـستەکانە و گەورەترینیانــە ، جــا خۆخــەریك کــردن پێــوەی و گــەڕان بەدوایــدا لەبــەرزترین داخوازییەکانە وە دەستکەوتنی بۆ بەندە لە شکۆدارترین بەخشراوەکانە .

٢ـ بێگومان ناسینی پەروەردگار بانگەشە دەکات بۆ خۆشەویستی و ترس و تکاو پاکی کردەوە بۆ خوای گەورە ، ئائەوە سەرچاوەی خۆش گـوزەرانی بەندەیـە ، وە ڕێگـەش نییە بۆ ناسینی پەروەردگار جگە بەناسینی ناو و صـیفەتەکانی و تێگەشـتن لـەواتاکانی نەبێت .

٣ـ بێگومان خوای گەورە بوونەوەری درووست کردووە بۆ ئەوەی بیناسن و بیپەرستن ئەوە کۆتا داوایە لـێیان ، خەریك بوون بەناسینی خوداو پەرستنی خەریك بوونە بـەوەی کە بەندە بۆی درووست کراوە ، وە وازهێنان و گوێ پێنەدانی گوێ پێنەدانـە بـەوەی کە بەندە بۆی درووست کراوە ، ناشرینە بۆ بەندە نـاز و نیعمـەتی خـودای بـەردەوام بەسەرەوە بێت و فەزڵی خۆی لەهەموو ڕوویەکەوە دابێت بەسـەریدا کەچـی ئـەویش نەزان بێت بەپەروەردگار و پشت هەڵکات لەناسینی .

٤ـ بێگومان یەکێك لە پایەکانی باوەڕ بەڵکو چاکترینیان و بنچینە تریان باوەڕ بوونە بە خودا ، وە باوەڕ هەر ئەوە نییە کەبڵێت باوەڕم بەخودا هێنا بەبێ ئەوەی کە خوا بناسێت ، بەڵکو ڕاستی باوەڕ ئەوەیە کە ئەو کەسە بناسێت کەباوەڕی پێ هێناوە وە توانای خۆشی ببەخشێت بۆ ناسینی ناو و صیفەتەکانی هەتا بگاتە پلەی یەقین ، وە باوەڕی بەگوێرەی ناسینی دەبێت بۆ خودا ، هەتا خودا زیاتر بناسێت ئەوا باوەڕی زیاتر دەبێت ، وە هەتا خودا کەمتر بناسێت ئەوا باوەڕی کەمتر دەبێت ، وە نزیکترین ڕێگە کە بەندە بگەیەنێت بەباوەڕی زیادە بیرکردنەوەیە لە صیفەت و ناوەکانی پەروەردگاری پاك و بەرز و بڵند .

٥ـ بێگومان زانست بە پەروەردگار بنچینەی هەموو شتێکە ، هەتا ئەو کەسەی کەبەڕاستی خوا دەناسێت ، بەڵگە دەهێنێتەوە بەوەی کەدەیناسێت لە صیفەت و کارەکانی پەروەردگار وە لەسەر ئەوەی کەدەیکات و دایدەنێت لە حوکمەکان ، چونکە خوای گەورە هیچ کارێك ناکات بەگوێرەی ناو و صیفەتەکانی نەبێت ، کارەکانی بازنەیەکە لەنێوان دادوەری و فەزڵ و داناییدا ، هەر لەبەر ئەمەیە هیچ حوکمێك لەحوکمەکان دانانێت مەگەر بەگوێرەی سوپاس و دانایی و فەزڵ و دادوەرێکەی نەبێت ، هەواڵەکانی هەمووی هەق و ڕاستە ، فەرمانەکانی و قەدەغەکردنەکانی پڕ لە دادوەری و داناییە [٣٦] .

هەر لەم سوودانە : ناسینی ناوە جوانەکانی پەروەردگار و صیفاتە بەرزەکانی ، داخوازی کاری شوێنەوارێتی بەندایەتی و ملکەچی ( واتە : ناسینی ناوە جوانەکانی پەروەردگار و صیفاتە بەرزەکانی ڕەنگدانەوەی دیارە لەبەندەدا کە چەندە ملکەچە وەرگێڕ ) ، جا بۆ هەموو ناوێك بەندایەتێکی تایبەت هەیە کەلەداخوازییەکانێتی ، وە چەند پێویستییەکی زانست پێی ، وە هێنانەدی بەناسینی ئەو صیفەتە ، جا ئەمە خواستراوە لەهەموو جۆرەکانی بەندایەتی کەلەسەر دڵ و ئەندامەکانی جەستەیە .

[٣٦] أنظر تفسير ابن سعدي ( ١: ٢٤ ـ ٢٦ ) ،وخلاصة تفسيره ( ص : ١٥ ) .

ڕوونکردنەوەی بۆ ئەمە ئەوەیە : کاتێك کەبەنـدە زانـی سـوود و زەرەر و بەخـشین و نەبەخشین و درووست کردن و ڕۆزی دان و مردن و ژیان تـەنها بەدەسـت خودایـە ، بێگومان ئەوە بەری بەندایەتی و پشت بەستنی بەپەروەردگار لەناخدا بۆ دەگرێت ، وە پێویستیەکانی پشت بەستن و بەرووبوومەکانی ڕووکەشیشی بۆ دێنێتەجێ .

وە کاتێك بەندە زانی کـە پـەروەردگار بیـسەر و بینـەرە و زانایـە بەئەنـدازەی دەنکـە خەرتەلـەیەك شتی لـە زەوی و ئاسمانەکاندا لێ وون نابێت ، وە خوا بەنهێنی و شارەوەش دەزانێت ، وە ناپاکی چاوەکان و ئەوەشی لـە سینەکاندایە دەزانێـت ، زانینـی ئەمانـە بەری پاراستنی زمان و ئەندامەکان و لێدانەکانی دڵی بۆ دەگرێـت لـەهـەموو ئەوانـەی کە خوا پێی ڕازی نییە ، وە ئەم ئەندامانەی پەیوەست بکات بەوەوەی کە پـەروەردگار خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە .

وە کاتێك بەندە زانی کە پەروەردگار دەوڵەمەند و سەخییە و چاکە خواز و میهرەبانەو چاکە زۆر دەکات ، ئەوە هێزی تکـاکردن پێویـست دەکـات لەسـەری ، جـا تکـاش لـەلایەن بەندەوە بەری جۆرەها بەندایەتی ناخ و ڕووکەش دەگرێت بەگوێرەی ناسینی و زانستی بەخوا .

وە کاتێك بەندە جوانی و تەواوی پەروەردگاری زانی ئەوە خۆشەویستییەکی تایبـەت و حەزێکی زۆر پێویست دەکات بۆ بەندە بۆ گەشـتنەوەی بـە پـەروەردگار ، وە ئائەمـە جۆرەها بەری زۆر دەگرێت لـە بەندایەتی .

ئا بەمانە دەزانرێت کە بەندایەتی هەرهەمووی دەگەڕێتەوە بۆلای پێویـستییەکانی نـاو و صیفەتەکانی پەروەردگار . ( ئەویش ناسین و تێگەشتنێتی : وەرگێڕ ) [37] .

وە کاتێك بەند خـوای خـۆی ناسـی ناسـینێکی ڕاسـت و داواکـراو و سـەلامەت لـە ڕێگاکانی خەڵکی لار و چەوت لەناسینی خوادا ، ئەو ناسـینەی کـە دانـراوە لەسـەر گۆڕین و فەرامۆش کردن و چۆنیەتی و شوبهاندنی ، جاهەر کەسێك سەلامەت بوو ئـا

---

[37] انظر (( مفتاح دار السعادة )) لابن القیم ( ص: ٤٢٤،٤٢٥ ) ، وانظر نحوه بأوسع منه في (( الفوائد )) له ( ص: ١٢٨،١٣١ ) .

لەم ڕێباز و ڕێگا بیروباوەڕە پووچانەی کەلەڕاستیدا گەورەترین بەربەستە لەنێوان بەندەو ناسینی پەروەردگاریدا ، وە گەورەترین ڕێگەیە بۆ کەمبوونەوەی باوەڕ و لاواز بوونی ، وە پەروەردگاری دەناسێت بە ناوە جوانەکانی و صیفاتە بەرزەکانی کە ناسراوە پێی لای درووست کراوەکانی ئەو ناو و صیفاتانەی کە هاتووە قورئان وسوونەتدا وە تێگەشتنیشی لەسەر ڕێبازی پێشینە چاکەکان ، جا هەرکەس وابوو ئەوا یارمەتی دراوە بۆ گەورەترین هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ .

وە فەرموودە بەصەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : کە بێگومان خوای گەورە نەوەت و نۆ ناوی هەیە ، هەرکەسێك بیان ژمێرێت دەبێت بە هۆکاری چوونە بەهەشتی .

فَفِي ـ الصَّحِيحَيْنِ ـ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رضي الله عنه ـ قَالَ ـ قَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ : ( إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَ تِسْعِينَ إِسْمَاً ، مِائَةً إِلاَّ وَاحِدَةً ، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ ) [٣٨] .

واتە : لەهەردوو پەرتووکە صەحیحەکانی پێشەوا بوخاری و موسلیمدا ( ڕەحمەتی خوایان لێبێت ) لەفەرموودەی ئەبو هورەیرەدا ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ : فەرموویەتی : ( بێگومان خوای گەورە نەوەت و نۆ ناوی هەیە ، سەد یەك دانە نەبێت، هەرکەسێك بیان ژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە ) .

( جا مەبەست لەژماردن لەبەرکردن و ژماردنی نییەو بەس ، چونکە لەوانەیە خراپە کارێکیش لەبەریان بکات و بییان ژمێرێت ، بەڵکو مەبەست پێی کردەوەکردنە پێیان)[٣٩] .

جا بۆیە پێویستە تێگەشتن لە ناو و صیفاتەکان و ناسینی ئەو بەڵگانەی کەلەسەرێتی لە واتاکانی هەتا گونجاو بێت سوودی تەواویان لێوەربگیرێت .

ئیمام أبو عمر الطلمنکي ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ـ (( لە تەواوی ناسینی ناو و صیفاتە بەرزەکانی خوای بالاْ دەست ئەوانەی کە پێویستە بانگخوازو کەسی پارێزگاری

---

[٣٨] أخرجه البخاري (٥:٣٥٤ :١١:٢١٤ : ١٢:٣٧٧: فتح ) ، و مسلم ( ٤:٢٠٦٣ ) .

[٣٩] (( فتح الباري )) ( ١١:٢٢٦ ) ، ئەمە وتەیەکی جوان و بەنرخە لە وتەکانی الأصیلي.

کار بیزانن ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی دەربارەی ناسینی ناو و صیفاتەکان و ئەو سوودانەشی لەخۆیانی دەگرن وەبەڵگەشن لەسەری لەڕاستییەکان ، وە هەرکەسێك ئەمانە نەزانێت ئەوا زانا نییە بەواتاکانی ناو و صیفاتەکان وە سوود مەندیش نابێت لەو واتایانەی کەبەڵگەن لەسەری باس دەکرێت ) [40] .

وە ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) سێ پلەی باس کردووە بۆ ئەوانەی ناوەکانی خوای پەروەردگار دەژمێرن :

پلەی یەکەم : ژماردنی ناوەکانی خوای پەروەردگار .

پلەی دووەم : تێگەشتنی واتاکانیان و وەبەڵگەشن لەسەر چی .

پلەی سێیەم : پاڕانەوە لە پەروەردگار پێیان ، ئەمە گشتگیرە بۆ پاڕانەوەی بەندایەتی و پاڕانەوەی داواکاری [41] . (( مەبەست بەپاڕانەوەی بەندایەتی وەکو ئەنجامدانی نوێژوو سەرجەم عیبادەتەکانی تر کەئەمانە لەخودی خۆیاندا پاڕانەوەن وەمەبەست بە پاڕانەوەی داواکاری وەکو داواکردنی ئەو پێداویستیانەی بەندە هەیەتی لەپەروەردگاری – وەرگێڕ ))

وە شێخ ابن السعدی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) واتای ( أَحْصَاهَا ) ڕووندەکاتەوە کەهاتووە لە فەرموودەکەی پێشوی ئەبو هورەیرە ( ڕەزای خوای لێبێت ) ، دەفەرموێت : (( واتای "أَحْصَاهَا" واتە : هەرکەسێك لەبەریان بکات و لەواتاکانیان تێبگات و وەباوەڕی پێیان هەبێت و وەبیانکاتە هۆکاری پەرستنی خوای پەروەردگار : پاشان دەچێتە بەهەشت ، وە بەهەشتیش ناچێتە ناوی باوەڕداران نەبێت بۆیە زانرا ئەوانە گەورەترین هەڵقوڵاو و ماددەن بۆ بەدەست هێنانی باوەڕ و بەهێز بوون و دامەزراندنی ، وە ناسینی ناوە جوانەکانی پەروەردگار بناغەی باوەڕە ، وە باوەڕیش دەگەڕێتەوە بۆلای )) [42] .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر : ٢٨

---

[40] (( فتح الباري )) ( ١١:٢٢٦ ) .
[41] (( بدائع الفوائد )) ( ١:١٦٤ ) .
[42] (( التوضيح البيان )) ( ص : ٢٦ ) .

واته : بەڕاستی لەبەندەکانی خوادا هەر زاناکان لـە خـودا دەترسـن ، چـونکە ئـەوان لەهەموو کەس زیاتر خودا دەناسن کە خاوەنی چ دەسەڵاتێکە .
وە ئیمـام ابـن جریـری طـبري ( ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ) لـە بـارەی ڕاڤـەی ئـەم ئایەتـەوە دەفەرموێت : (( پەروەرگاری یاد بەرز و بڵند دەفـەرموێت : تـەنها زاناکـان لـە خـوا دەترسن و خۆیان لەسزای دەپارێزن بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ، چونکە خوای گەورە تواناو دەسەلاّتی هەیە بەسەر هەر شتێکدا کەبیەوێت ، وە چیشی بوێـت دەیکـات ، وە هەرکەسێك ئەمەی زانی یەقینی دەبێت کە سزا دەدرێت لەسەر تاوانەکانی بۆیە لـەخوا دەترسێت ترسێك کە سزای بدات )) [٤٣] .
وە ابن کثیر ( ڕەحمەتی خوای لێبێـت ) دەفـەرموێت : (( تـەنها زانـا خواناسـەکان بەهـەق و ڕاستی لە خوا دەترسن ، چونکە تا ناسـینی خـوای گـەورە و زانـا زیـاتر بێـت ، ئـەو خوایەی کە وەصفکراوە بە صیفاتی تەواو و ناوە جوانەکان ، هەتا ناسین و زانست پێی زیاتر و تەواوتر بێت ئەوا ترسان لەو گەورەترو زیاتر دەبێت ))[٤٤] .
وە یەکێك لە زانا پێشینەکان واتـای ئەمـەی کۆکردۆتـەوە لـە ووتەیـەکی کورتـدا ، فەرموویەتی : (( هەرکەسێك پەروەردگار زیاتر بناسێت ئەوا زیاتر لێی دەترسێت ))[٤٥] .
وە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : (( ڕۆحەکان پێویـستیان بـەهیچ شتێك نییە گەورەتر بێـت لـە پێویـستیان بـە درووسـت کاریـان و بەدیهێنـەریان ، وە خۆشەویـستی و یـاد و گەشـاوەیی و داوای هۆکـار و نزیکبوونـەوە لـە پـەروەردگار لەهەموو شتێك پێویستترە بۆ ڕۆحەکان ، وەڕێگەش بۆ ئەوە نییە جگە بەناسـینی نـاو و صیفاتەکانی نەبێت ، چەندە بەندە زاناتر بێت بە نـاو و صـیفاتەکان ئـەوا زیـاتر خـوا دەناسێت و داوای لێدەکات و لێی نزیکتر دەبێـت ، وە تـا کـەمتر نـاو و صـیفاتەکان بناسێت و لێی شارەزا بێت ئەوا زیاتر بەخوا نەفامتر دەبێت و حەزناکات پێی بگـات و

---

[٤٣] (( تفسیر الطبري )) ( ١٣٢:١٢ ) .
[٤٤] (( تفسیر ابن کثیر )) ( ٥٥٣:٣ ) .
[٤٥] (( الرسالة القشیریة )) لأبي القاسم القشیري ( ص: ١٤١ ) ، بێژەری ئەم ووتەیە : أبو عبد الله یە کەناوی أحمدی کوڕی عاصمی الأنطاکي یە ، بڕوانە ژیانەکەی لە کتێبی (( السیر )) ( ٤٠٩:١١ ) .

دوورتر دەبێت لێی ، وە پـەروەردگاریش بەنـدە لـەپلەیەکـدا دادەنێـت لـەلای خـۆی بەوشێوەیەی کە بەندە خوا دادەنێت لەلای خۆی )[46] . ـ واتـە : تابەنـدە زیـاتر خـوا بناسێت و خۆشی بوێت و بیبەوێت لێی نزیك بێتەوە ئەوا زیاتر لای خـوا پلـە بـەرزتر دەبێت والله أعلم وەرگێڕ.

ناسینی خوای بالأدەست لایەنی ترسـان لـەخواو چـاودێری بـەهێز دەکـات ، وە تکـا گەورەتر دەکات لەدڵدا ، وە باوەڕی بەندەش زیاد دەکات ، وەچـەندین جـۆری زۆر بەروبووم دەگرێت لە بەندایەتی ، وە ڕێگەش نییە بۆ ئـەو ناسـینە جگـە بەبیرکردنـەوە نەبێت لە کتێبی خوای گەورە و وە ئەو صیفاتانەی کە پەروەردگا خـۆی پێناسـاندووە لەلای بەندەکانی لەسەر زمانی نێردراوەکانی ( سەلامی خوایان لەسەر بێت ) لە ناو و صیفات و کردەوەکـانی وە ئەوەشـی کـەخۆی لێـی بـەپاك ڕاگرتـووە لەوانـەی کەشـایەن و شایستەی پەروەردگاری پاك و خاوێن نییە .

وە بیرکردنەوە لە ڕۆژ و کارەکانی خوا لە خۆشەویستان و دووژمنانیدا کە گێڕاویێتەوە بەسەر بەندەکانیـدا و بـۆی سـەلماندوون ، بـۆ ئـەوی ببێـت بەبەڵگـە لەسـەریان کـە پەروەردگار خوای ڕاست و ڕوونە ئەو خوایەی کەبەندایەتی بەس شایەنی ئەوە ، وە بۆ ئەوی ببێت بەبەڵگە کە پەروەردگار بەسـەر هـەموو شـتێکدا بەتوانایـە ، وە بەهـەموو شتێك زانایە ، وە خوای گەورە تۆڵەی توندوو بەهێزە ، وە لێبووردە و میهرەبانیـشە ، وە دەسەڵات دار و دانایە ، وە چیشی بوێت دەیکات ، وە خوایەکی ئەوتۆیە زانست و میهرەبانییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتـەوە ، وە هـەموو کارەکـانی بازنـە و خولگەیـە لەنێوان دانایی و میهرەبانی و دادوەری و چاکەکاریدا هیچ شتێك لەکارەکانی لەمانـە دەرناچێت ، وە ئەمە بەروبوومێکە ڕێگە نییە بۆ بەدەست هێنـانی جگـە بەبیرکردنـەوە نەبێت لە وتەکانی و تێڕامان لەشوێنەواری کارەکانی[47] .

---

[46] (( الكافية الشافية )) ( ص: ٤٠٣ ) .
[47] انظر (( مفتاح دار السعادة )) لابن القيم ( ص: ٢٠٢ ) .

جا هەر كەس سەرپێچی ئەم ڕێگەیـە بكـات ، وە لادا لـەم ڕێگـە ڕاسـتە ، وە ڕێگـەی خەڵكە چـەوت و لارەكـان بگرێـت لەناسـینی پـەروەردگاردا ، ئـای چـەندە دووری دەخاتەوە لـە ناسینی پەروەردگاری و درووسـت كـاری ، بـەڵكو دەبێـت بـەلاوازترین كەس لـەناسینی پەروەردگاری ، وە كەمترین كەسێك كە ترسی لێی دەبێت .

وە پێشەوا ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دوای ئـەوەی كـە جیـاوازی خـەڵك ڕوون دەكاتەوە لـە ناسینی خوادا ئەو جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیان لـەناسینی دەقەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە تێگەشتنی و شارەزایی بـەخراپی ئـەو شـوبهانەی پێـچەوانەی ڕاستیەكانیەتی ، دەفەرموێت : (( لاوازترین كەسێ كە ببینی لـە چاو ڕۆشنیدا ئەوانـەن كە ئەهلی عەقیدەی پوچ و بەتاڵن ، ئەوانەی خراپن و پێشین بەخراپ باسیان كردوون ، لـەبەر نەزانیان بەدەقەكان و تێگەشـتن لێـی ، وەجـێگیر بـوونی شـوبهەی بـەتاڵ لـە دڵیاندا)) .

پاشان ڕوونیكردۆتەوە كە خەڵكی نەزان حاڵیان زۆر باشترە لەو كۆمەڵە وەناسینیشیان بۆ خوا لـەوان زیاترە ، دەفەرموێت : (( كاتێك بیردەكەیتەوە لـەحاڵی هـەموو خـەڵك ئەوانەی كەلای زۆربەی ئەو خاوەن عەقیدە بەتاڵانە باوەڕدار نین ، كەچی دەیـان بـینی لـەوان چاو ڕۆشن ترن وە باوەڕیشیان پتەوترە وە لـەوان زیاتریش تەسلیمی وەحی بوون وە ملكەچ تریشن بۆ هەق و ڕاستی )) [48] .

وە پێشەوا ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) پێش ئەم وتانـە ئاگـاداری دا لـەسـەر گرنگـی چاوڕۆشنی لـە یەكتاپەرستی ناو و صیفاتەكان و زانینیان ، وە تێگەشتنیان لـەسەر ڕێگەی پێشینە چاكەكان ، لـەسەر گرنگی ئاگادار بوون لـە شوبهەكانی ئەهلی كەلام ئەوانەی بیروباوەڕیان بەتاڵ و خراپەكارن لـەبەرامبەر ئەم یەكتا پەرستییە پاكە .

پاشان ووتەیەكی بەسوودی گشتگیری بەخشندەی باسـكرد كـەهۆكارە بـۆ ئـەم چـاو ڕۆشنییە ، فەرمووی : (( گرێی ئەمە ئەوەیە كە دڵت شایەتی بۆ خودای بـەرز و بڵنـد

---

[48] (( مدارج السالكين )) ( ١:١٢٥ ) .

بدات ، كه وەستاوه لـەسەر عەرشی ، فەرمايـشت دەفـەرموێت بـە كـردن و قەدەغـە كردن ، بينەره بە جوڵەكانی جيهان سەرو خوارو وە بـە هـەموو ئەوانەشـی تيايدايـە ، بيـسەری دەنگەكانيانـە چـاودێره لـەسـەر نـاخ و نهێنيـەكانيان ، وە فـەرمانی هـەموو كاربەدەستان و پادشاكان لـەژێر بەڕێوەبردنی ئەودايە فەرمان لـەخۆيـەوە دادەبـەزێت و بەرزيش دەبێتەوە بۆلای خۆی ، وە فريشتەكانی لـەبەردەسـتی خۆيـدان : فەرمانـەكانی جێبەجێ دەكەن لـەهەموو قوژبنەكانی دنيادا ، وەصف كراوه بـە صـيفەتی تـەواو ، وە وەصـف كـراوه بەصـيفەتی گـەورەيی ، پـاك و بێگـەرده لـە هـەموو عـەيبێك و كەموكورتييەك و هاو وێنەييەك ، بەوشێوەيەيە كە وەصفی خۆی كردووه لە كتێبەكەيدا ، وە لـەسەرو ئەو وەصفانەشەوەيە كە بەندەكانی وەصفی دەكەن ، زيندووه و نامرێت ، ڕاگری بوونەوەرو بەرِێوبەری كـاری درووسـتكراوەكانێتی و ناخـەوێت و وەنـەوزيش نايگرێت ، زانايە هيچ شـتێك لێـی وون نابێـت لـە ئاسمانـەكان و زەويـشدا تەنانـەت بەئەندازەی دەنكە خەرتەلـەيەك ، بينەره جووڵەی مێروولـەيەكی ڕەش دەبينێت لـەسـەر بـەردێكی گـەوره لـەشـەوێكی تاريكـدا ، بيـسەره تەنانـەت ژاوه ژاوی دەنگـەكانيش دەبيستێت بـەجياوازی زمانـەكانيش وە هـەموو داواكـاری پێويـستيەكانيش ، هـەموو ووتەكانی هاتۆتە جێ بەراستی و دادوەری ، وە صيفاتەكانی بەرزتره لـەوەی كە پێوانـە بكرێت بە صيفاتی درووستكراوەكانی لە وێنە و لێكچووندا ، وە زاتی خـودا بـەرزتره لـەوەی كـە بـشوبهێنرێت بەشـتێك لـەزاتـەكان ، وە فراوانـی كردەوەكـانی هـەموو درووستكراوەكانی گرتۆتەوه لە دادوەری و دانـايی و ميهرەبـانی و چـاكەو فەزڵـدا ، هەموو دروستكردن و فەرمانێك بۆ ئەوه وە هەموو نـاز نيعمـەت و موڵـك و سـوپاس وستايش و گەورەيی هەر بۆ ئەوه ، يەكەمەو پێش ئەو هيچ شتێك نەبووه ، وە كۆتايەو هيچيش دوای ئەو نامێنێت ، ديارو ئاشكرايە و هـيچ شـتێك لـەسـەرو ئـەوەوه نييـە ، پەنهان و نادياره هيچ شتێك لـەو پەنهانتر نييە ، ناوەكانی هەرهەمووی ناوی سـوپاس و ستايش و بەگەورەدانانە ، هەر لـەبەر ئەوەيە ناوەكانە هەمووی جوانە ، وە صيفاتەكانی هەمووی صيفاتی تەواون ، وە وەصفەكانی هـەمووی وەصـفی شـكۆمەند و گـەورەن،

کارەکـانی هەرهــەمووی دانــایی و میهرەبــانی و چــاکە و دادوەرییــە ، هەمووشــتێك لەدرووستکراوەکانی بەڵگەن لەسەر ئەوە وە ڕێنیشاندەرن بۆکەسێك کە بیان بینێـت بەچاو ڕۆشنی ، زەوی و ئاسمانەکان و ئەوەشــی لەنێوانیانــدا هەیـە بەبـەتاڵ درووسـتی نەکردووە ، وە وازیشی لە مرۆڤەکان نەهێناوە بەبەلاش بیٚ هودە ، بەڵکو بوونـەوەری درووست کردووە بۆ هەستان بە پەرستنی و ڕاگرتنی یەك تایی پەروەردگار ، وە نـاز و نیعمەتی خۆی ڕشـتووە بەسـەریاندا بـۆ ئـەوەی بیکـەن بـەهۆکاری سوپاسـی و زیـاتر بەسەریاندا برژێنێت لە ناز و نیعمەتی خۆی ، خۆی ناساندووە بەبەنـدەکانی بـەجۆرەها ناساندن ، وە چەندین نیشانەشی بـۆ هێناونەتـەوە ، لـەگـەڵ جۆرەهـا بەڵگەشـدا ، وە بانگیشی کردوون بۆ خۆشەویستی خـۆی لەهـەموو دەرگاکانـەوە ، لەپـەیمانی خـۆیی کردۆتـە گـەورەترین و بـەهێزترین هۆکـار لــەنێوان خـۆیی و بەندەکانیـدا ، نیعمەتـە جوانەکانی خۆی بەتەواوی داوە بەسەریاندا ، وەهەستاوە بەجیٚ بـەجیٚ کردنـی بەڵگـە تەواوەکانی بەسەریاندا (کەناردنی مەنهەج و پێغەمبەرانە ـ سەلامی خوایـان لێبێـت ـ ) نیعمەتی خۆشی ڕشتووە بەسەریاندا ، وە میهرەبانیشی لەسەر خۆی پێویست کردووە ، وە ئەو نووسراوەشی لەخۆی گرتووە کـە میهرەبانێکـەی زاڵ و سـەرکەوتووە بەسـەر تووڕەیەکەیدا ) [٤٩] .

جا هەرکەسێك ئاوا خوا بناسێت ، وە تێبگات لەم چاو ڕۆشـنییە ، ئـەوا لەبـەهێزترین کەس دەبێت لەباوەڕدا ، وە لەباشترینیان دەبێت لە بەگـەورە ڕاگرتنـی خـواو زانینـی چاودێری خوا بەسەریەوە ، وە لەهەموویان زیاتر گوێڕایـەڵی خـوا دەکـات و لێـوەی نزیك دەبێتەوە ، وە خەڵکیش لەمەدا جیاوازن تیایاندایە کەم و وە تیاشیاندایە زۆر .

---

[٤٩] (( مدارج السالكين )) ( ١:١٢٤،١٢٥ ) ، وانظر أيضا (( المدارج )) ( ٣:٢٥٢،٢٥٣ ) ، و (( الوابل الصيب )) لابن القيم ( ص: ١٢٥،١٢٩ ) .

سێیەم :ـ

## بیرکردنەوە لە ژیانی پێغەمبەری بەڕێز ﷺ

بێگومان لەهۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ ڕوانینە لە ژیانی پێغەمبەرە ﷺ وە خوێندنی وبیرکردنەوەی ئەوەی کە تیایدا باسکراوە لە صیفاتە جوانەکانی و ئاکارە بەرزەو جوانەکانی ، پێغەمبەر ﷺ ڕاگر و پاك بووە لەسەر وەحی (( قورئان )) پەروەردگار ، وە هەڵبژاردەی بووە لە درووستکراوەکانیدا ، وە باڵوێزی نێوان پەروەردگار و بەندەکانی بووە ، نێردراو بووە بە ئاینێکی بەرز و بڵند ، وە بە ڕێگایەکی ڕاست ، پەروەردگار ناردویێتی بە ڕەحمەت بۆ جیهان ، وە بەپێشەوا بۆ پارێزکاران ، وە بەبەڵگە بۆ لەسەر کۆی مرۆڤەکان ، ناردویێتی لە کات و وەختێکدا کە ناردنی پێغەمبەرانی تر (سەلاَت و سەلامی خویان لێبێت ) زۆری بەسەردا ڕۆشتووە و کاتی ناردنی بووە ﷺ ، وە خوای گەورە بەبۆنەی ئەوەوە هیدایەتی داوە بۆ بەهێزترین و ڕۆشنترین ڕێگە کە (ئیسلام ) ەوە فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی گوێڕایەڵی کردنی و ڕێزلێگرتنی وبەگەورەدانانی و خۆش ویستنی و هەستان بەمافەکانی وە هەموو ڕێگاکانی داخستووە جگە لەبەهەشت ئەویش بۆ هیچ کەسێك ناکرێتەوە جگە لەڕێگەی ئەوەوە نەبێت ، وە دڵی گوشاد و ڕووناك کردۆتەوە بە ناسینی پەروەردگار ، وە ناویشی بەرز کردۆتەوە و وە هەرچیش نارەحەتییە لەکۆڵی کردەوە ، وە بچووکی زەلیلی گێڕا بەسەر ئەوەی پێچەوانەی فەرمانی کرد ، بەڵکو ڕێگە بۆ هیچ کەسێك نییە کەلەدوای ئەوەوە بێت بییەوێت لەخۆشی و شادیدا بژی لە دونیا و دوارۆژدا مەگەر بەشوێن کەوتن و گوێڕایەڵی و ڕۆشتن نەبێت لەسەر ڕێبازی ئەو .

بۆیە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : (( ئالێرەدا دەزانرێت و دەردەکەوێت ناچاری بەندەکان لەسەرو هەموو پێویستیەکەوە بۆ ناسینی پێغەمبەروﷺ ئەوەشی پێی هاتووە ، وە بەڕاست دانانی ئەوەی کە هەواڵی داوە ، وە گوێڕایەڵی کردنی لەوەی کە فەرمانی پێکردووە ، چوونکە ڕێگە نییە بۆ خۆش گوزەرانی لە دونیا

و دوارۆژدا جگه لـه ڕێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت ( سەڵات و سەلامی خویان لێبێـت ) وە ڕێگه نییه بۆ ناسینی پاك و پیس بەشێوەیەکی فراوان لەڕێگەی ئەوانەوە نەبێت ، وە هەرگیس کەس ناگات بەڕەزامەندی پەروەردگار جگه لەسەر دەستی ئـەوان نـەبێت ، جا چاکه لـه کردەوە و ووته و ڕەوشتدا نییـه جگـه لـەڕێگای ئەوانـەوە نـەبێت و وە ئەوەشی که پێی هاتوون ، وە ئەوان تەرازووی ڕاست و دروستن کـه لەسـەر ووتـه و کردەوە و ئاکار و ڕەوشتی ئەوان ووته و کردەوە و ئاکار و ڕەوشـتەکان دەپێورێـت ، وە بەشوێن کەوتنیان خـەڵکی هیدایـەت دراو لەخـەڵکی گـومڕا جادەکرێتـەوە ، جـا پێویستی بەوان زیاتر و گەورەتره لـه پێویستی جەسته بەڕۆح ، وە چاو بەڕۆشنایی ، وە ڕۆحیش به ژیان ، جا چـی پێویـستییەك پێویـست بێـت ئـەوا پێویـستی بەنـده بـۆلای پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خویان لێبێت ) زۆر لەسەروو تره ، جا گومانت چـۆنه بەکەسێك کاتێك هیدایەتەکەی و ئەوەی کەپێی هاتووه لێـت وون ببێـت بەئەنـدازەی چاو تروکاندنێك ، دڵـت تێك دەچێت و خراپ دەبێت وە وەك ماسییەکی لێدێت کـه لەئاو جیابێتەوە ، وە لەووشکانییەکدا دابنرێت ، بۆیه حاڵی بەنده کاتی جیابوونـەوەی لەوەی که پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خویان لێبێت ) پێی هاتوون وەك حاڵی ئـەو ماسییه وایه بەڵکو خراپ تریش ، بەڵام هەست بەمه ناکات جگه لـه دڵـی زینـدوو ، بۆیه شاعیر دەڵێت : وَمَا لِجُرْحٍ بِمَيِّتٍ إِيلاَمُ ـ واتـه : مـردوو چـەنده برینـداری کـەی ئازاری پێناگات [50] .

جا کاتێك خۆش حاڵی بەنده لەهەردوو دونیادا هەڵواسراو بوو به ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ پێویسته لەسەر هەموو کەسێك که ئامۆژگاری نەفـسی خـۆی دەکـات وە خـۆش حاڵی و سەرفرازی بۆی دەوێت ، ڕێباز و ژیان و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ بناسـێت وە ئەوەشی که پێی دەردەچێت لـه گرۆی نەفامان به پێغەمبەر ﷺ وە ئەوەشی که پێـی

---

[50] ئەو نیو دێڕە شعرە هی موتەنەبییە سەرەتاکەی ئەمەیە (( مَنْ يَهُنْ يَسْهُلِ الهَوَانُ عَلَيهِ )) واته : هەرکەسێك سووکایەتی بکـات بەخـەڵك ئەوا سووکایەتیش لەسـەری ئاسانه . ئەمه لەشعرێکه موتەنەبی مەدحی ئەبو الحوسـەین دەکات که ناوی عەلی کوڕی ئەحمەدی المـڕی یـه ، بڕوانه دیوانی موتەنەبی لاپەڕە : ١٦٤ ـ دار بیروت .

دەچێتە ڕیزی شوێن کەوتوانی و کۆمەڵەکەی ، جا خەڵکی ئالەم حاڵەدا لە نێوان یان سەربەخۆیە ، یاخود کۆششی زۆرە ، یاخود بێ بەشە ، فەزڵ و بەخشش بەدەست پەروەردگارە دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە بیەوێت ، وە هەر پەروەردگار خاوەن بەخششی گەورەیە )) [51] .

هەر لەبەر ئەمەیە هەر کەسێك سونەت بخوێنێت و فێری ببێت وە بیربکاتەوە لەوصیفاتانەی پێغەمبەر ﷺ کە باسیان هاتووە لە قورئان و سوونەت و کتێبەکانی سیرەدا ، ئەوا خێر بۆ نەفسی خۆی زیاد دەکات ، وە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ زیاد دەبێت ، وە ئەو خۆشەویستییە شوێن کەوتنی پێغەمبەری ﷺ بەمیرات بۆ دەگرێت لە کردەوە و گوفتاردا ، بۆیە ـ بنچینەی بنچینەکان زانستە وە سوود بەخشترینی زانستەکان ڕوانین و تێڕامانە لە ژیانی پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵەکانی ( ڕەزای خوایان لێبێت ) )) [52] .

جا بۆ وێنە هەر کەسێك بڕوانێت لەو وتەیەی خوای گەورە سەبارەت بە وەصفی پێغەمبەرەکەی ﷺ وە چەند ئایەتێکی تریش : کە دەفەرموێت : ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾
التوبة: ١٢٨

واتە : سوێند بێت بێگومان هاتووە بۆتان پێغەمبەرێك لە خۆتان هەر نارەحەتییەکتان تووش بێت بەلایەوە سەختەو پێی نارەحەت دەبێت ، زۆریش سوورە لەسەر بڕوا هێنانتان بۆ بڕواداران زۆر دڵسۆز و بەبەزەییە .

وە ئەم وتەیەی پەروەردگاریش کە دەفەرموێت : ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾
القلم: ٤

[51] " زاد المعاد " ( ص ـ ٦٩،٧٠ ) .
[52] " صيد الخاطر " لابن الجوزي ( ص : ٦٦ ) .

واته : بێگومان تۆ لەسەر خوو ڕەوشتێکی زۆر گەورەو پەسەندی .

وە هەروەها ئەم وتەیەی پەروەردگاریش کە دەفەرموێت : ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٥٩

واته : بەهۆی ڕەحمەت و میهرەبانی و بەزەیی پەروەردگارەوەیە کە تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە نەرم ونیان بوویت لەگەڵیاندا خۆ ئەگەر تۆ قسە ڕەق و توڕەو دڵ ڕەق بویتایە ئەوا دەورووبەریان چۆڵ دەکردیت .

وە بیربکەرەوە لە سونەت و تێی بڕوانە کە هاتووە لە هاوەڵانەوە ( ڕەزای خوایان لێبێت ) لە وەصفی پێغەمبەر ﷺ وەك فەرموودەی دایکمان عائیشە ( ڕەزای خوای لێبێت ) کە دەفەرموێت : (( مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَينِ ، إلاّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا ، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمَاً فَإِذَا كَانَ إِثْمَاً كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ ، وَمَا إِنْتَقَمَ لِنَفْسِهِ إلاّ أَنْ تُنْتَهَكَ مَحَارِمُ اللهِ فَيَنْتَقِمُ للهِ بِهَا )) [٥٣] .

واتە : هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لە نێوان دوو کاردا سەرپشك نەکراوە هەمیشە ئاسانەکەیانی وەرگرتووە ئەگەر تاوان نەبووبێت ، جا ئەگەر تاوان بوایە دوورترین کەس دەبوو لێی وە هەرگیز لەبەر خاتری خۆی تۆڵەی نەسەندووە مەگەر سنووری خوا بەزێندرابێت ئەوکاتە تۆڵەی سەندۆتەوە لەبەر خوا .

وە لەفەرموودەی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرموێت : (( خَدَمْتُهُ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ ، فَوَاللهِ مَا قَالَ لِي أُفّ قَطُّ ، وَلا قَالَ لِشَيْءٍ فَعَلْتُهُ : لِمَ فَعَلْتَ كَذَا ؟ وَلا لِشَيْءٍ لَمْ أَفْعَلْهُ : أَلا فَعَلْتَ كَذَا ؟ ))[٥٤] .

واته : دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ کرد جا سوێند بەخوا هەرگیز ئاخ و ئۆف لێنەکردم وە هەرگیز شتێکی پێنەوتم کە کردبووم ، بۆچی وات کرد ؟ وەبۆ شتێکیش کەنەمکردبێت ، خۆزگە ئەوەت بکردایە .

وە دەفەرموێت : (( كَانَ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ ، وَأَجْمَلَ النَّاسِ ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ )) [٥٥] .

---

[٥٣] أخرجه البخاری ( ٦:٦٦ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٨١٣ ) .
[٥٤] أخرجه البخاري ( ١٠:٤٥٦ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٨٠٥ ) .

واته : پێغەمبەر ﷺ سەخی ترین کەس بوو ، وە جوانترین کەس بـوو ، وە ئـازا تـرین کەس بوو .

وە دەفەرموێت : (( كَانَ رَسُولُ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً ))[٥٦].

واته : پێغەمبەر ﷺ جوانترینی خەڵك بوو لەڕەوشتدا .

وە فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عـەمر ( ڕەزای خوایـان لـێبێـت ) : دەڵـێ : (( أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ فَاحِشاً وَلا مُتَفَحِّشاً ، وَ أَنَّهُ كَـانَ يَقُـولُ :(( خِيَـارُكُم أَحْـسَنُكُم أَخْلاَقَاً ))[٥٧].

واته : بێگومان پێغەمبـەر ﷺ نـە قـسەی خـراپ و ناشـرینی دەکـرد و نـە بلاویـشی دەکردەوە وە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : (( باشترینتان ئەوەتانە کـە زۆر خـو ڕەوشـتی جوانە)).

وە لەفەرموودەی ئەبو سەعیدی خودریدا ( ڕەزای خوای لێبێـت ) : دەڵـێ : (( كَـانَ رَسُولُ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ العَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا ، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئاً عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ))[٥٨].

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ صیفەتی وابوو لە کچە عازەبی ناو دەوار شەرمی زیاتر بوو وە کاتێك شتێکی پێناخۆش بووایە بەدەمووچاویدا دەمانزانی .

وەجگە لەمەش کەباسکردنیان زۆری دەوێت .

بێگومان هەر کەسێك بیر لـەمـە بکاتـەوە ئەوپـەڕی سـوودی لێوەردەگرێـت ، پاشـان بێگومان ئەمە گەورەترین هۆکارە کە خۆشەویستی بەهێز دەکات لەدڵی موسوڵماندا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ وە خۆشەویستی زیاتر بۆ پێغەمبەر ﷺ زیادەیە لـەباوەڕدا ، وە ئـەم خۆشەویـستییە شـوێن کـەوتنی و کـردەوەی چـاکیش بـەمیرات دەگرێـت ، وە ئەمـە لەگەورەترین دەرگاو ڕێگاکانی هیدایەتە .

---

[٥٥] أخرجه البخاري ( ٦:٩٥ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٨٠٢ ) .
[٥٦] أخرجه مسلم ( ٣:١٦٩٢ ) .
[٥٧] أخرجه البخاري ( ١٠:٤٥٦ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٨١٠ ) .
[٥٨] أخرجه البخاري ( ٦:٥٦٦ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٨٠٩ ) .

وە بێگومان پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرموویەتی بۆ هیدایەت چەند هۆکارێك و چەند ڕێگایەکی جۆراوجۆر هەیە ، ئەمەش لە بەزەیی پەروەردگارە بۆ بەندەکانی ، لەبەر جیاوازی بیر و هۆش و چاو ڕۆشنیان ، وە فەرموویەتی لەو هۆکارانە بیرکردنەوە لە حاڵ و وەصفەکانی پێغەمبەر ﷺ وە ئەمەش هۆکاری هیدایەتی هەندێك لەخەڵکە .

جا ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرموویەتی : لەخەڵکدا هەیە هیدایەت وەردەگرێت بە شارەزایی و ناسینی بەحاڵی پێغەمبەر ﷺ وە ئەوەشی کەلەسەری درووست کراوە لە تەواوی ڕەوشتەکان و کردەوەکان و صیفاتەکانی ، وە عادەتی پەروەردگاریش وایە کەسێك سەر شۆڕ ناکات کە ئەم وەصفانە و ئەم کردەوانە ڕەنگی تیادا دابێتەوە ، لەبەر زانستی بە پەروەردگار و ناسینی ، وە کەسێکیش سەر شۆڕ ناکات کە بەم شێوازە بێت ، هەروەك دایکی باوەڕداران خەدیجە ( ڕەزای خوای لێبێت ) بە پێغەمبەری ﷺ وت : (( أَبْشِرْ فَوَاللهِ لَنْ يُخْزِيَكَ اللهُ أَبَدًا ، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ ، وَ تَصْدُقُ الحَدِيثَ ، وَ تَحْمِلُ الكَلَّ ، وَ تَقْرِي الضَّيفَ ، وَ تُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الحَقِّ )) [٥٩] [٦٠] .

واتە : پێی فەرموو : (( مژدەت لێبێت هەرگیز پەروەردگار سەر شۆڕت ناکات ، چونکە تۆ خزمایەتی بەجێدەهێنیت و لە ووتەدا ڕاستگۆ دەبیت و باری نارەحتی خەڵك دەخەیتە سەرشانی خۆت و ڕێز لە میوان دەگریت و یارمەتی و کۆمەکی ڕاستییەکان دەکەیت )) .

وە شێخ ابن السعدی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرموویەتی : لە ڕێگاکانی پێویستیەکانی باوەڕ و هۆکارەکانی ، ناسینی پێغەمبەرە ﷺ وە ناسینی ئەوەشی کە ئەو لەسەری بووە لە ڕەوشتە بەرزەکان و صیفاتە تەواوەکان جا هەرکەسێك بەتەواوی بیناسێت ئەوا گومانی لەڕاستی خۆی و ڕاستی ئەوەشی کە پێی هاتووە لە قورئان و

---

[٥٩] رواه البخاري ( ١:٣٣ ـ فتح ) ، و مسلم ( ١:١٤١ ) ، ئەم فەرموودەیە بەشێکە لە فەرموودەیەکی درێژ .

[٦٠] (( مفتاح دار السعادة )) ( ص: ٣٤٠ ) ، وانظر أيضا ( ص: ٣٢٣ ) .

سونەت و دینی ڕاست بۆ درووست نابێت ، هەروەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٦٩﴾ المؤمنون: ٦٩ .

واتە : یاخود ئەوەیە کە ئەوانە پێغەمبەرەکەیان نەناسیوە بۆیە ئاوا دژی دەوەستن و نکوڵی لێدەکەن .

بۆیە ناسینی پێغەمبەر ﷺ پەلە و خێرایی پێویست دەکات بۆ بەندە بۆ باوەڕ هێنان لەوانەی کە باوەڕیان نەهێناوە ، وە باوەڕی زیادەش بەرجەستە دەکات بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان پێهێناوە .

وە پەروەردگار خەڵکی هان دەدات بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان لە حاڵی پێغەمبەرﷺ کە بانگخوازە بۆ باوەڕ ، دەفەرموێت : ﴿۞ قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ٤٦﴾ سبا: ٤٦ .

واتە : تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ بەو کۆمەڵە بێ باوەڕە سەرکەشانە من بەیەك وشە و خەصڵەت ئامۆژگاریتان دەکەم کە لەبەر خوا دوو دوو یەك یەك هەستن و هەوڵبدەن پاشان بیربکەنەوە جا ئەو کاتە باش دەزانن کە هاوەڵەکەتان کە پێغەمبەرە ﷺ شێت نییە (( جنۆکەی لەگەڵ نیە )) هەروەك ئێوە دەڵێن بەڵکو ئەو هۆشیار کەرەوە و بێدار کەرەوەیە وە دەیەوێت لە سزای قورسی ڕۆژی دوایی ئاگادارتان بکاتەوە .

وە پەروەردگار سوێن دەخوات بە کامڵی و تەواوی ئەوە پێغەمبەرە ﷺ وە گەورەیی ڕەوشتی ، وە کامڵ ترین مرۆڤە بەم ئایەتە کە دەفەرموێت : ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤﴾ القلم ١ : ٤ .

واتە : سوێند بە " قەڵەم " و بەهەر شتێکی ڕاست و درووست کە پێی دەنووسن ، ئەم سوێندە بۆ پاکێتی پێغەمبەرە ﷺ لەو بوهتانانەی کە بۆی دەکرا دەمێ دەیانووت شێتە

دەمیٚ دەیانووت جادوو کەرە ، تۆ بەرامبەر ناز و نیعمـەت و چـاکەی پـەروەردگارت شێت نیت هـەروەك ئـەو نەفامانـە دەڵـێن ، وە بێگومـان تـۆ پاداشـتێکی بـەردەوام و نەبڕاوەت بۆ هەیە ، وە بێگومان بەڕاستی تۆ لـەسەروو خوو ڕەوشتێکی بەرزەوەیت .

پێغەمبەر ﷺ گەورەترین بانگخوازە بۆ باوەڕ لە صیفات و ئاکارە جوانەکانیدا ، وە لـە وتە ڕاستەکانی و کردەوە ڕاست و ڕەواکانیدا ، گـەورەترین و تـەواوترین پێـشەوایە ، هـەروەك پـەروەردگار دەربـارەی دەفـەرموێت : ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب: ٢١ .

واتە : بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ چاکترین نموومەی ڕێك و پێکی و سەرمەشقە بۆتان .

وە پەروەردگار دەربارەی پێمان دەفەرموێت :﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر: ٧ .

واتە : پێغەمبەر ﷺ چی پێدان و لەچـیدا فـەرمانی پێکـردن ئـەوا جێبـەجێی بکـەن وە لەچیشدا ڕێگری لێکردن ئەوا ئێوەش لێی دوور بکەونەوە و مەیکەن .

وە بەڕاستی خوای گەورە دەربارەی خاوەن هۆش و ئەقڵەکانی کە تایبەتی بوونەوەرانن دەفەرموێت دەڵـێن : ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا : واتـە : پـەروەردگار بێگومـان ئێمـە گوێمان لە بانگخوازێك بوو ، کە پێغەمبەرە ﷺ : يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ - بانگەشەی دەکرد بۆ باوەڕ هێنان ، بە وتەی و ڕەوشتی و کـردەوەی و دینـەکی و وە بـە هـەموو حـاڵی دەیفەرموو :أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ﴿١٩٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٣ . باوەڕ بێنن بە پەروەردگارتان ئێمەش باوەڕمان هێنا باوەڕێك کە گومان نەچێتە ناوی ، هـەر لـەبـەر ئەوەیـە پیـاوێکی دادپەروەر کە هیچ ویستێکی نەبوو جگە لـە شوێن کەوتنی ڕاستی ، هەر بەوەندەی کە پێغەمبەری ﷺ ببینیایە یاخود وتەیەکی ببیستایە یەکسەر پەلەی دەکرد بۆ باوەڕ هێنـان

**بێ ، وە گومانیشی نەدەبوو لـە پەیامەکەیدا ، بەڵکو زۆربەیان تەنها بەبینینی دەموچاوی جوانی دەیزانی ئەمە دەموو چاوێکی درۆزن نییە ))** [٦١] .

[٦١] (( التوضيح البيان )) ( ص: ٣٠،٢٩ ) .

چوارەم :-

## بیرکردنەوە لە جوانییەکانی ئاینی ئیسلام

بێگومان ئاینی ئیسلام هەمووی جوانییە بیرو باوەڕی ڕاستڕینی بیر و باوەڕ و سوود بەخشتڕیانە ، وە ڕەوشتەکانی جوانتڕین ڕەوشتەکانە ، وە کردەوەکانی و یاساکانی جوانتڕینی یاساو داد پەروەرتریانە .

جا بەم ڕوانین و تێڕامانە گەورە و جوانە لە جوانییەکانی ئەم ئاینە ، پەروەردگار باوەڕ جوان دەکات لەدڵی بەندەدا ، وە خۆشەویستی دەکات لەلای ، هەروەك بەو باوەڕە منەتی داوە بەسەر هەڵبژاردەی دروست کراوەکانی بەم فەرمایشتەی کە دەفەرموێت:

﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ ۝٧ ﴾ الحجرات: ٧ .

واتە : بەڵام پەروەردگار بڕوای لا خۆشەویست کردوون وە لەنێو دڵتاندا ڕازاندویەتییەوە .

بۆیە باوەڕ لەدڵدا لەگەورەترین شتە خۆشەویستەکانە ، وە جوانتڕینی شتەکانە ، وە بەبۆنەی ئەوەوە بەندە شیرینی باوەڕ دەچێژێت و دەستی دەکەوێت لە دڵیدا و ناخیشی جوان دەکات بە بنەماکانی باوەڕ و ڕاستییەکانی ، وە ئەندامەکانی جەستەش جوان دەبێت بەکردەوەکانی باوەڕ [٦٢] .

وە پێشەوا ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرموویەتی : (( کاتێك بیرتکردەوە و ڕوانیت لە حیکمەتە جوان و درەوشاوەکان لەم ئاینە تۆکمەیەدا و ئەم میللەتە پاك و ئەم شەریعەتە موحەمەدییەدا کە هیچ دێڕ و ووشەیەك ناتوانێت بەتەواوی باسی بکات و وە هیچ وەصفێك ناگات بەجوانییەکەی وە پێشنیاری هیچ کەس لەهۆشمەندانیش ئەگەر ئەقڵی هەرهەموویان کۆببێتە لەسەر ئەقڵی ئاقڵ ترینیان بەگوێرەی ئەقڵە تەواو و

[٦٢] انظر : (( التوضيح البيان )) لابن السعدی ، ( ص : ٣٣،٣٢ ) .

بەرزەکان هەر ناتوانێت بگات بە جوانییەکەی و شایەتی دان بەگەورەییەکەی ، وە هیچ شەریعەتێك نەهاتۆتە دنیاوە تەواوترو گەورەتر بێت لەم شەریعەتە ، خۆی بۆ خۆی شایەت و شایەتی بۆ دراوە ، بەڵگەیەو بەڵگە بۆ هێنراوەیە ، داواکار و بەڵگەشە ، وە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بەبەڵگەوە نەهاتایە ئەوا خۆی بەس بوو بە بەڵگە و شایەت و نیشانە کە لەلای پەروەردگارەوەیە )) [٦٣] .

هەر لەبەر ئەمەیە کە بیرکردنەوە لەجوانییەکانی ئەم دینە و وە ڕوانیین لەوانەی کە تێیدا هاتووە لە فەرمانەکان و قەدەغە کراوەکان و بابەتە دانراوەکانی شەرع و یاساکان و ڕەوشتەکان و ئادابەکان ، لە گەورەترینی بانگخواز و پاڵنەرەکانە بۆ چوونە ناوی بۆ کەسێك کە باوەڕی نەهێنابێت ، وە بۆ زیاد بوونی باوەڕی کەسێك کە باوەڕی هەبێت بەڵکو کەسێك بیرکردنەوەی بەهێز بێت لەجوانییەکانی ئەم ئایینەو وە پێیەکانی دامەزراو بێت لە ناسینی و ناسینی جوانییەکانی و تەواویەتێکەی و وە ناشرینی ئەو کەسەی سەرپێچی بکات ، ئەوا دەبێت بە بەهێزترینی کەس لە باوەڕدا و وە جوانترینیان لە دامەزراویدا لەسەری و وە بەهێزترینیان لە دەست پێوە گرتنی .

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرموویەتی :

((مەبەست ئەوەیە کە کەسەتایبەتەکانی ئەم ئوممەتەو بەهۆشترینیان و ژیرترینیان ، کاتێك ئەقڵ و هۆشیان شایەتی جوانی و گەورەیی و تەواوی ئەم دینەی دا ، وە شایەتی ناشرینی و کەمی و کەم نرخی ئەوانەی دا کە سەرپێچی دەکەن ئەوا باوەڕ و خۆشەویستی باوەڕ تێکەڵی خۆشی ناو دڵیان بوو ، جا بۆیە ئەگەر سەرپشك بکرێت کە بخرێتە ناو ئاگرەوە یاخود ئاینێکی تر هەڵبژێرێت ئەوا هەڵدانە ناو ئاگر و لێکردنەوی ئێسکەکانی هەڵدەبژێرێت لەبری گۆڕینی ئایینەکەی ، وە ئەم وێنەیەش هی ئەو کەسانەیە کە پێیەکانیان جێگیر بووە لە باوەڕدا ، وە دوور ترینی کەسن لە

---

[٦٣] (( مفتاح دار السعادة )) ( ص : ٣٢٤ ) ، و انظر أيضا ( ص : ٣٢٨ ) وما بعدها .

هەڵگەڕانەوە لە دین ، وە ڕاسترینیانن بە دامەزراوی لەسەری هەتا ڕۆژی گەشتنەوە بە پەروەردگار )) [٦٤] .

وە شایەتی لێرەدا بۆ ئەو وتەیەی کە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرمووی ـ ئەم فەرموودەیەی ئەنەسی کوڕی مالیکە ( ڕەزای خوای لێبێت ) : کە دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ثَلاَثٌ مَن كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ أَنْ يَكُونَ اللهُ وَ رَسُولَهُ أَحَبَّ إِلَيهِ مِمَّا سِوَاهُمَا ، وَ أَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلاَّ للهِ ، وَ أَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ )) [٦٥] .

واتە : سێ شت هەیە هەر کەسێك تیایدا بێت ئەوا شیرینی ئیمانی دەست کەوتووە ، کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشەویستر بێت لەلای لە هەموو شتێك ، وە خەڵکی خۆش بوێت خۆشی نەوێت تەنها لەبەر خوا نەبێت ، وە پێی ناخۆش بێت کە بگەڕێتەوە بۆ کوفرو بێباوەڕی هەروەك چۆن پێی ناخۆشە کە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە .

ئائەوەیە کە شیرینی باوەڕی چەشتووە ، وە خۆشییەکەی تێکەڵی ڕەشییەکانی ناو دڵی بووە ، وە بووە بە ڕۆشنایی و نور بۆی ، وە ئارامی پێگرتووە توووند ترین ئارامی ، نزیك نییە دوای ئەوە کە بگەڕێتەوە بۆ کوفر و گومڕایی و شوێن کەوتنی هەواو گومانە درۆکان ، بەڵکو لە چەسپاو ترینی خەڵکە لە باوەڕدا وە توندترینیانە لە دامەزراوی و دەست پێوە گرتنیدا ، وە بەهێز ترینیانە لە پەیوەندی بە خوای خۆی و دروستکارییەوە چونکە چۆتە ناو ئیسلامەوە بە زانست و متمانە و ناسینەوە ، بەهاو جوانی و پاکێتی ئیسلامی ناسیوە ، وە جیاوازییەکانیشی لە دینەکانی تر ، بۆیە ڕازی بووە پێی کە ببێت بە دین بۆی ، وە هۆگر دەبێت پێی بە بەهێزترینی هۆگری ، چۆن دوای ئەمە ویستی گۆڕینی دەبێت ، یان دەیەوێت ڕووی خۆی لێوەرگێڕێت ، یاخود بیەوێت کە لاچێت لەسەری و بیگۆڕێت .

---

[٦٤] (( مفتاح دار السعادة )) ( ص : ٣٤٠،٣٤١ ) .

[٦٥] أخرجه البخاري ( ١:٦٠ ـ فتح ) ، و مسلم ( ١:٦٦ ) .

**هەر لەبەر ئەمەیە بێگومان لە سوودە گەورە دەرهێنراوەکان لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە دەژمێررێت بە بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی ئەهلی سوونە و جەماعە لەسەر زیاد بوونی باوەڕ و کەمبوونەوەی ، وە جیاوازی ئەهلی سوونە و جەماعە تیایدا ، هەروەك باوکم فەرموویەتی ( خوا بیپارێزێت ) : دەربارەی تێگەیشتنی ئەم فەرموودەیە و ئەوەشی لێی دەردەهێنرێت ـ وە چەند شتێکی باس کردووە یەکێك لەوانە ـ لەم فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر جیاوازی خەڵکدا لە باوەڕدا ، وە باوەڕ زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ وە کەمیش دەکات بە تاوان ، وە هەر کەسێك ئەو سێ ئاکارەی فەرموودەکەی تیادا بێت ئەوا شیرینی باوەڕی دەست کەوتووە بەپێچەوانەی غەیری خۆی [66] .**

[66] (( عشرون حديثا من صحيح البخاري دراسة أسانيدها و شرح متونها )) للوالد الكريم الشيخ عبد المحسن العباد ، حفظه الله و رعاه ( ص : ١٦٨ ) .

پێنجەم : ـ

## خوێندنەوەی ژیانی پێشینەی ئەم ئومەتە

بێگومان پێشینەی ئـەم ئومەتـە : هـاوەڵانی پێغەمبـەرو ﷺ شـوێن کـەوتوانی خـەڵکی سـەرەتای یەکـەمی ئیـسلام بـوون ، ئـەوان چـاکترینی سـەدە و پـارێزەری ئیـسلام و ڕێنیشاندەری مرۆڤەکان و شێری کۆسپەکان بوون و خەڵکی ئامادە بوو بوون لە جێگە گەورە و نارەحەتیەکاندا وە هەڵگری ئـەم دینـە و گـوازەرەوەی بـوون بـۆ ئەوانـەی لەدوای ئەوانە هاتن لە جیهاندا ، بەهێزترینی کەس بوون لـە بـاوەڕدا دامـەزراو تـرین بوون لە زانستدا و چاکترین بوون لە دڵدا و پاکترین بوون لـە نەفـسدا ، وە تایبـەت کراوە لە ناویشیاندا هاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ ( ڕەزای خوایـان لێبێـت ) ئەوانـەی کـە پەروەردگار شەرەف مەندی کردن بەبینیی پێغەمبەر ﷺ وە ناز و نیعمەت داری کردن بە بەڕوانین بۆ شەوقی ، وە ڕێزداری کردن بە بیستنی دەنگی و ئارامی بە وتەکانی ، وە ئایینیان لێوە وەرگرت بـە پـاراوی و نـەرم و نیـانی ، وە دڵیـان بەهۆیـەوە دامـەزرا و نەفسیشیان پێی ئارام بوو وە دامەزران لەسەری وەك دامەزراوی کێوەکان .

وە بەسە لە ڕوونکردنەوی گەورەیی ئەواندا کە پـەروەردگار بـەم فەرمایـشتەی پێیـان دەفەرموێت :﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠ .

واتە : هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لـێبێت ) چاکترینی گەلـەکانن ، وە سـوود بەخـشترینی خەڵکن بۆ خەڵك .

وە لـە " صەحیحی پێشەوا موسلیمدا " لـە ئـەبو هـورەیرەوە ( ڕەزای خـوای لێبێـت ) دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خَيرُ أُمَّتِي القَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِ ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُم ... )) [٦٧] .

---

[٦٧] صحيح مسلم ( ٤:١٩٦٤ ) و أخرجاه في (( الصحيحين )) من حديث عمران بن حصين بلفظ : (( خير أمتى قرنى ، ثم الذين يلونهم )) : البخاري ( ٧:٣ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤:١٩٦٤ ) .

واتە : (( چاکترینی ئومەتەکەم ئەو سەدەیەیە کە تیایدا نێردراوم ، پاشان ئەوانـەی کـە بەدوایاندا دێن )) .
جا هەر کەسێك بیربکاتەوە لـە حاڵی ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردەیە وە ژیانیان بخوێنێتـەوە و چاکەکانیان بزانێت وە بیربکاتەوە لـەوەی کە لـەسەری بوون لـە خورەوشتێکی گەورەو جوان ( واتە لـەسەر رێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ ) وە پابەند بوون بە پێغەمبەری گەورە و پیرۆزەوە ﷺ وە لـەسەر پەیمان بۆ باوەڕ و ترسان لـە تاوان و سەرکەشی و خۆپاراستن لە ڕووپایی و دوو ڕوویی ، وە ڕووکردنە گوێڕایەڵی و پێشبڕکێکردن لـە کاری چاکە جا بڕوانە بە ووردی لـە حاڵیان و بەهێزی باوەڕیان و پتەوی بەندایەتییان بۆ پەروەردگار و بەتەنگەوە چوونیان بۆ سەر گوێڕایەڵی پەروەردگار و پشتکردنیان لە دونیـای لـەناو چوو وە ڕووکردنیان بەرەو دوا ڕۆژی بێ کۆتایی ، چونکە لـە ماوەی ئەو بیرکردنەوە و ڕوانینـە لـەسـەر هەنـدێك برگـە لـە جوانییـە زۆرەکـان لـە وەصـفکانیان مرۆڤـەکان ڕادەگرێت و بانگیان دەکات بەڕاستی شوێن کەوتنیان و خۆشەویستی خـۆ ڕازاندنـەوە بە صـیفاتەکانیان و یادکردنـەوەیان یادکردنـەوەی بەندایەتییـە بـۆ پـەروەردگار ئینجـا بیرکردنەوەی حاڵیان باوەڕ بەهێز دەکات و دڵـەکان ڕۆشـن دەکاتـەوە ، ئـای چـەند جوانە کە بێژراوە : كَرِّرْ عَلَيَّ حَدِيثَهُم يَا حَادِي فَحَدِيثُهُم يَجْلِي الفُؤَادَ الصَّادِي .
دووبارەی بکەرەوە بەسەرمدا باس و خواستیان ئەی ئـەو کەسـەی حـەیران بـۆ وشـتر دەڵێیت چونکە باس و خواستیان دڵی تینو ڕۆشن و پاراو دەکات .
وە جێگـەی بیرکردنـەوە و بـەدوادا گـەڕان لـە ژیـان و هەواڵـەکانی ئـەو کۆمەڵـە هەڵبژاردەیە وە سوود وەرگرتن لـەوانەی کە بە صەحیحی لـە پەرتووکەکانی مێـژوو و زوهد و وەرع چەند کتێبێکی تردا هاتووە ، جا ئەو بیرکردنـەوە و تێڕامانـە جـوانترین چواندن بۆ خاوەنەکەی بە میرات دەگرێت لـەو کۆمەڵە ، هەروەك شـیخ الإسـلام ابـن تيمية : ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ( وَمَنْ كَانَ بِهِم أَشْبَهُ كَـانَ ذلـك فِيـهِ

**أَكْمَلُ )** [٦٨] **: واته : هەر کەسێك زیاتر لەوان بچێت ئەوا هەمان خۆشەویستی و بەندایەتیکردنی ئەوانی تیادایە بۆ خوای پەروەردگار** [٦٩] **.**

**وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت : (( مَنْ تَشَبَّهَ بِقَومٍ فَهُوَ مِنْهُم )) .**

**واتە : هەر کەسێك خۆی بشوبهێنێت بە گەلێك ئەوا لەوانە .**

**جا ئەوانەی کە لەپێشەوە ڕابوورد هەرهەموویان باوەڕ زیاد دەکەن و بەهێزی دەکەن ، وە هەرهەموویان بە پلە پلە لەژێر زانستی شەرعیدان ئەوانەی کە وەرگیراون لە قورئان و سوونەت و ئەوەی کە پێشینەی ئەم ئومەتە لەسەری بوون .**

**پاشان زانستەکانی تر جگە لە زانستی شەرعی وەك زانستی پزیشکی و ئەندازیاری و هەسارە ناسی و ژمێریاری و خۆراك ناسی و جگە لەمانەش لە زانستەکانی تر کە لەسەردەمی نوێدا فراوانە لەبەردەست خەڵکدا کە زیاتر لە ڕێژەی خۆی گوێی پێدەدرێت و هەوڵی بۆ دەدرێت ، هەتا زۆرێك لەوانەی کە گوێی زۆر پێدەدەن و هەوڵی بۆ دەدەن خەریك و بێ ئاگا بوون لە فێربوونی پێویستییەکانی دین و ئەو کارە دیار و ڕوونانەکانی کە پێویستن بزانرێت ، وە هەروەها ئەو زانستانەی تر کاریگەریەکی زۆر و دیاری هەیە لە زیاد بوونی باوەڕ بۆ کەسێك کە خۆی خەریك بکات پێوەی و گوێی پێ بدات بۆ بەدەست هێنانی ئەگەر نیاز و نییەتی پاك و ویستی ڕاست و دووری لە هەوا و ئارەزوو بێت .**

**وە چەند لە پیاوان باوەڕی هێناو زیادی کرد بە بۆنەی خەریکبوونی بە پزیشکییەوە و وەستانی لەسەر کارە سەر سووڕهێنەرەکانی پەروەردگار و ووردی کارەکانی لە درووستکردنی مرۆڤەکاندا ، وە ئەوەشی کە تیایدا دای ڕشتووە لە سەرسووڕهێنەرەکانی بوونەوەر وە ووردی کارەکانی ئەوەی کە هۆشەکان تووشی سەرسووڕهێنان دەکات و خاوەن ئەقڵەکان تووشی سەر لێشێوان دەکات .**

---

[٦٨] (( العبودية )) ( ص : ٩٤ ) .

[٦٩] **لەبەرگرنگی و تەواوکاری بۆ قسەکەی پێشەوامان شەیخی ئیسلام پێمخۆشە قسە جوانەکەی وەکو خۆی بێنم بێ پچڕاندن** ((العبودية شيخ الإسلام ابن تيمية (ص: ٤٦) - ولهذا كانت محبة هذه الأمة لله اكمل من محبة من قبلها وعبوديتهم لله اكمل من عبودية من قبلهم واكمل هذه الأمة في ذلك اصحاب محمد صلى الله عليه وسلم ومن كان بهم اشبه كان ذلك فيه اكمل فأين هذا من قوم يدعون المحبة. ))

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ التين: ٤ .

واته : سوێند بەو شتانەی کە لەپێشوە پەروەردگار باسی کردووە بێگومان ئێمە ئادەم و نەوەیمان درووست کردووە لە جوانترین شێواز .

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾ ﴾ التغابن: ٣ .

واتە : بە جوانترین شێوە وێنەی کێشاون و سەرەنجامیش هەر بۆلای ئەوە .

﴿ وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات: ٢١ .

واتە : هەروەها لە نەفسی خۆشتاندا چەندین پەند و حیکمەت ودانایی هەیە کە بەڵگـە لەسـەر تـاك و تـەنیایی پـەروەردگار وە بەڵگەشـە لەسـەر ئـەوەی کـە پـەروەردگار بوونەوەری بە بەلاش و خۆڕایی دروست نەکردووە .

وە هەروەها خەریکبوون بە کۆی زانستەکانی تر کە باوەڕی مرۆڤـەکان زیـاد دەکـات بەگوێرەی بیرکردنەوەی و تێڕامانی و گەڕانی بۆ بەدەست هێنانی ڕاستی ، وە کارەکان لـەسەرەتاو کۆتاییدا بەدەستی پەروەردگاری پـاك و بێگـەردە ، وە هـەر کەسـێك ئـەو بیەوێت ڕێنموویی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست .

پاشان بێگومان ئەم زانستانە کاریگەری لەسەر زیاد بوونی باوەڕ نابێت بەوە نەبێت کـە خاوەنــەکانیان بیربکەنــەوە و تێــڕامێنێن لــە نیــشانە و بەڵگــە ڕوون و ئاشــکراکانی پەروەردگار ، جا ئەگەر کاتێك ئەو زانستانە بیرکردنەوە و تێڕامانی لەدەستدا ئەوا ئەو سوودە ڕۆشنە و بەروبوومە گەورەیە لەدەست دەدات ، وە سـوود بـە خاوەنەکەشـی ناگەیەنێت ئەو سوودەی کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ بـاوەڕی بـەزیاد بـوون و بـەهێزبوون و دامەزراوی .

وە ئەمــەش پێویــستی بیرکردنــەوە و تێڕامانمــان بــۆ ڕوون دەکاتــەوە لــە نیــشانەکانی پەروەردگار و درووستکراوەکانیدا ، وە هۆکاری دووەمە لە هۆکارەکانی زیاد بـوونی باوەڕە کە باسی ئەم بەشەشە کە دێت .

هۆكاری دووەم لە بشی پێنجەم : ـ

## بیركردنەوە لە نیشانە گەردونیەكانی پەروەردگار

بێگومان بیركردنەوە لە گەردووندا و ڕووانیین لە درووستكراوە جۆراوجۆرە سەر سووڕهێنەرەكانی خوادا لە ئاسمان و زەوی و خۆر و مانگ و هەسارەكان و ئەستێرەكان و شەو و ڕۆژ و كێوەكان و درەختەكان و دەریا و ڕووبارەكان و جگە لەمانەش لەدرووستكراوەكانی پەروەردگار لەژمارە نایەت ، لەگەورەترینی بانگەشەی باوەڕ و وە لەسوود بەخشترینی هۆكارەكانی بەهێزبوونێتی .

بیربكەرەوە لە درووستكردنی ئاسمان وە چاو بگێڕە تیایدا جار لەدوای جار ، چۆن دەیبینیت لە گەورەترینی نیشانەكانە لە بەرزی و بڵندی و فراوانی و جێگیردا بەشێوەیەك بەرز نابێتەوە وەك ئاگر وە داش نابەزێت وەك پارچەو كەل و پەلی قورس وە نە كۆڵەكەی لەژێردایە نە پەیوەندیشی بەسەروشیەوە هەیە ، بەڵكو ڕاگیراوە بە توانا و دەسەڵاتی خودا ، پاشان بیربكەرەوە لە ڕێكێكەی نە شەق بوون و نە چاڵ و چۆڵی نە لارولوێری تێدایە .

پاشان بیربكەرەوە لەو ڕەنگەی كە لەسەری دانراوە ، كە جوانترین ڕەنگ و بەهێزترینیانە لەگەڵ گونجاویدا لەگەڵ چاودا .

وە بیربكەرەوە لە درووستكردنی زەوی و چۆنیەتی درووستكردنی ، دەیبینی لە گەورەترینی نیشانەكانی بەدیهێنەرەكەیەتی پەروەردگاری پاك و بێگەرد درووستی كردووە كردویێتی بە ڕاخەر و لانكە و بێشە ، وە ملكەچی كردووە بۆ بەندەكانی ، وە ڕۆزی و خۆراك و ژیانیانی تیادا گێڕاوە ، وە چەند ڕێگای تیادا داناوە بۆ ئەوەی بێن و بڕۆن پێیدا بۆ پێویستیەكانیان و كار و كردەوەكانیان ، وە دایمەزراندووە بە كێوەكان وەك مێخ دایكوتیوە بۆ ئەوەی بیپارێزێت وە ئەملاولا و لەرزە بە بوونەوەرەكانی سەری نەكات ، وە جەمسەرەكانی فراوان كردووە و بەشێوەی هێلكەیی درێژی كردۆتەوە و

ڕایخستووە و فراوانی کردووە لە لاکانییەوە وە کردویەتی بە جێگـای کۆبوونـەوە بـۆ زیندووەکانیان دەیان گرێتە خۆی لەسەر پشتی مادەم زیندووبن ، وە هەروەها کردوێتی بە جێگای کۆبوونەوە بۆ مردووەکانیان ، دەیان گرێتە خـۆی لـە نـاو خۆیـدا کاتێـك دەمرن ، بۆیە پشتی نیشتیمانە بۆ زیندووەکان وە ناویشی نیشتیمانە بۆ مردووەکانیان .

پاشان بڕوانە بۆ زەوی دەیبینی وشك و مردوو ملکەچە ،وە کاتێك پەروەردگار بارانی بەسەردا دەبارێنێت بەجوڵە دێت و ئەژیەتەوە و گەشە دەکات و سـەوز دەبێـت و لـە هەموو جـۆرە گژوگیایـەکی جـوان دەڕوێـت ئینجـا سەرسـوڕهێنەر ترینـی سـەوزایی دەردەکات لە ڕوانین و دەرهاتنیدا خۆشحاڵکەرە بۆ ئەوانەی لێی دەڕوانن وە سەخیشە بۆ ئەوانەی دەستی بۆ درێژبکەن ( واتە ـ بیانەوێت لێی بکەنەوە ) .

پاشان بیربکەرەوە پەروەردگار چۆن ئەملاولاکانی زەوی ڕاگرتووە بە کێوە دامـەزراوە بڵندە پتەوەکان ؟ وە چۆن دایمەزراندوون بەجوانترینی دامەزرانـدن ؟ وە چـۆن بـەرزی کردوونەتەوە وە کردویەتی بە پتـەو ترینـی بەشـی سـەر زەوی ، لەبـەر ئـەوەی تێـك نەشکێت بە درێژایی زەمان و یەك بەدوا یەکی باران و با بەسەریدا ، بەڵکو بە وردترین شێوە دروستی کردووە و بە باشترینیش دایناوە ، وە تیایـدا دایـناوە چـەندین سـوود و کانزا و کانی .

پاشان بیربکەرەوە لەو هەوا نەرم و نیانە ڕاگیراوەی نێوان ئاسمـان وزەوی هەسـتی پـێ دەکرێت بە بۆنەی هەستی لێدانەوە لەکاتی هەڵکردنیدا هەست بەبوونی دەکرێت بەڵام خۆی نابینرێت ، دەشگەڕێت لەنێوان ئاسمان و زەوی ، وە باڵندەکانیش بە ئەڵقە ئەڵقە بە باڵەکانیان تیایدا دەگەڕێن هەروەك ئاژەڵە ئاوییەکان لـە ئـاودا مەلـە دەکـەن ، وە لاکانی و شەپۆلەکانی دەجووڵێنەوە لەکاتی هەڵکردنیدا هـەروەك شـەپۆلی دەریاکـان دەجوڵێنەوە .

پاشان بیربکەرەوە چۆن پەروەردگار بەو بایە هەورێکی ملکەچ بەدی دەهێنێت لە نێوان ئاسمان و زەویدا کە دەیان بزوێنێت و بڵاویان دەکاتەوە پاشان نێوانیان یـەك دەخـات و هـەنێکیان جـوت دەکـات بـە هەندێکیانـەوە ، پاشـان بـا موتوربـەی دەکـات ، ئـەو

موتوربەیەی کە پەروەردگار ناوی لێناوە بە ( لَوَاقِح ) ، پاشان ڕەوانەی دەکات بۆ سەر جێگای خۆی بۆ ئەو زەوییەی کە پێویستی پێیەتی ، جا کاتێك هەورەکە لەسەرو ئەوزەوییەوە وەستا کە پێویستی بە ئاوە بارانی لێوە باری بەسەریدا ئەوا پەروەردگار بایەك لە بەرگە هەوادا بۆ ئەو هەورە دەنێرێت و بڵاوی دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی ئەو بارانە هەمووی بەیەك جار لەو هەورە نەبارێت و زیان بەو جێگایە بگەیەنێت و کاولی بکات ، هەتا ئەو زەوییە تێر ئاو دەبێت پێویستی خۆی وەردەگرێت لەو بارانە ، ئینجا پەروەردگار لێی دەگرێتەوە ، ئەوەیە ئاو داشتە و تێر ئاوی زەوی هەڵگیراوە لەسەر پشتی باکان .

پاشان بیربکەرەوە لەو دەریایانەی کە دەوری زەوی و وڵاتانیان داوە ئەو دەریایانەی کە بەشێکن لە زەریای گەورە بەکۆی زەویدا بڵاو بوونەتەوە ، هەتا وشکانی زەوی و کێوەکان شاروشارۆچکەکان لەچاو ئاودا هەروەك دورگەیەکی بچکۆلە وایە لەناوەڕاستی دەریایەکی گەورەدا ، وە پاشماوەی زەویش غەرقی ئاوە ، ئەگەر وەستان و ڕاگرتنی پەروەردگاری باڵادەست نەبوایە بە توانا و دەسەڵاتی بۆ ئاو ئەوا ئاو سەر زەوی پڕدەکرد و سەردەکەوتە سەر هەمووی .

وە بیربکەرەوە لە شەو و ڕۆژ کە لە سەر سوڕهێنەر ترین نیشانەی پەروەردگارن ، چۆن شەوی کردووە بە پۆشاك و مایەی حەوانەوە و ئارامی جیهان دادەپۆشێت و جوڵەکان تیایدا دەوەستێت ، وە ئاژەڵەکان دەگەڕێنەوە لانەکانیان ، وە باڵندەکان دەگەڕێنەوە هێلانەکانیان ، وە ڕۆحەکان ئاسوودە دەبن و دەحەوێنەوە لە نارەحەتی کۆشش و هیلاکی ، هەتا ئەوکاتەی ڕۆحەکان ئارامی و ئاسوودەیی و سرەوتی خۆیانی لێوە وەردەگرن ، جا کاتێك بەدیهێنەر و شەق کەری شەو لە ڕۆژ کە پەروەردگارە هێز و زەرباز دێنێت کە مژەدەدەری ڕۆژە ئەوا ئەو تاریکییە تێك دەشکێنێت و پەرت پەرتی دەکات وە لای دەبات لەسەر جیهان جا ئەوانیش ( واتە : مرۆڤەکان ) دەبینن ، جا ئیتر ڕۆح لەبەران بڵاودوبنەوە و دەڕۆن بۆلای بژێوی و کارەکانیان و باڵندەکانیش لە هێلانەکانیان دەردەچن .

ئای لەو زیندوکردنەوەیە کە بەڵگە و نیشانەیە لەسەر توانا و دەسەلآتی پەروەردگار لەسەر بەڵێنی گەورە ( کە قیامەت و زیندووکردنەوەیە ) .

وە بیربکەرەوە لە بار و دۆخی خۆر و مانگ وەلە هەڵهاتن و ئاوا بونیاندا بۆ دامەزراندنی هەردوو ولآتی شەو و ڕۆژ ، ئەگەر هەڵهاتنی ئەوان نەبوایە ئەوا کاری جیهان بەتاڵ و مایە پووچ دەبوو ، وە چۆن خەڵکی هەوڵی بژێویان دەدا وە چۆن هەڵسوکەوتیان دەکرد بۆ کارەکانیان ئەگەر ژیان هەمووی تاریکستان بوایە لەسەریان؟

وە چۆن خۆش بەخت دەبوون بەژیان لەگەڵ نەبوونی ڕووناکی﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الفرقان: ٦١: ٦٢ .

واتە : بەرز و بڵندە ئەو پەروەردگارەی کە چەندین ئەستێرەی درەوشاوەی لە ئاسمانـدا داناوە و جێنشین کردووە وە چرایەکی پرشنگدار کە ( خۆر ) ە وە مانگێکی ڕۆشنیشی تێدا داناوە بۆ ڕووناکی شەو و ڕۆژ ـ وە هەر ئەو پەروەردگارەیە کە شەو و ڕۆژی جێنشین کردووە و بەنۆرە بەدوای یەکدا دێن ، جا ئەمانە بۆ کەسێکە کە بیربکاتەوە تیایاندا یاخود سوپاس گوزار بێت .

وە بیربکەرەوە لە درووستکردنی گیانلەبەر لەسەر جیاوازی صیفەتەکانی و چەشن و شێوەیان و چۆنیەتەکەیان و سوودەکانیان و ڕەنگەکانیان و وە ئەو شتە سەرسوڕهێنەرەی کە تیایاندایە ، تیایاندایە لەسەر سك دەڕوات ، وە تیایاندایە لەسەر هەردوو قاچی دەڕوات ، وە تیایاندایە لەسەر چوار پێ دەڕوات ، وە تیایاندایە قاچی بۆ کراوە بە چەك و تفاقی وەك خاوەن چنگەکان ، وە تیایاندایە دەنوکی بۆ کراوە بە چەك و تفاقی وەك داڵ و هەڵۆ و قەلە ڕەش ، وە تیایاندایە دانەکانی بۆ کراوە بە چەك تفاقی، وە تیایاندایە شاخەکانی بۆ کراوە بە چەك تفاقی بەرگری پێدەکات لەخۆی .

وە بیربکەرەوە و پەند وەربگرە بەگشتی لە دانانی ئەم جیهانە و گونجاندنی بەشەکانی و ڕێکخستنی لەسەر جوانترین ڕژێم و یاسا هەموو ئەمانە بەڵگەیە لەسەر تەواوی

دەسەڵاتی بەدیهێنەرەکەی و تەواوی زانستی و وە تەواوی حیکمەت و ووردبینییەکەی، کاتێك تۆ بیرتکـردەوە لـەم جیهانـە دەیبینیـت وەك مـاڵێکی ئامـادە کـراو لـەهـەموو ئەوکەرەستانەی کە پێویستێتی ، ئاسمان سەقفێکی بەرزکراوەیە بەسەرییەوە ، وە زەویش لانکە و جێی ئارامی و ئاسوودەییەی ڕاخراو لانکەی جێنشینەکانێتی ، خۆر و مـانگیش دوو چران هەڵدێن تیایدا ، وە ئەستێرەکانیش وەك گڵۆپ و جوانکـاری وان بـۆی وە ڕێنیشاندەر و بەڵگەن بۆ کەسێك کە بیەوێت بـە ڕێگاکـانی ئـەم ماڵـەدا بـڕوات ، وە گەهەر و کانزا هەڵگیراوەکان وەك زەخیرە و بەروبوومە ئامادەکراوەکـان تیایـدا هـەر یەکێك لـەمانە بۆ دۆخی گونجاوی خۆی دەبێـت ، وە دەرکـەوتنی گـژو گیـاو سـەوز بوونیان ئامادەکراوە بۆ پێویستی خـۆی ، وە جـۆری ئاژەڵـەکان بـەکار دەهێنـرێن بـۆ بەرژەوەندیـەکان ، تیایدایـە بـۆ سـواربوونە ، وە تیایدایـە بـۆ شـیرە ، وە تیایدایـە بـۆ گۆشـتەکەی ، وە تیایدایـە بـۆ پۆشـاك ، وە تیایدایـە بـۆ درووسـتکردنی شـتومەك و پێداویستی ، وە تیایدایە بۆ پاسەوانی ، وە پەروەردگار مرۆڤی سەرپشك کـردووە وەك پادشایەکی دەست واڵا کراو ئالـەو دنیا گونجاوەی کە تیایدایـە ، کـە هەڵـسوکەوت بکات بە ئیش وکارەکانی ، جا ئالـەمانەدا گەورەترین و بەهێزترین بەڵگە هەیە لـەسـەر درووستکارێکی زانای دانای ووردبین کە پەروەردگارە ، ئەو پەروەردگارەی کە ڕێزی لەبەنـدەکانی نـاوە بـەجوانترین ڕێـز ، وە درووسـتکردنیانی ڕێکخـستووە بـەجوانترین ڕێکخستن .

بەڵکو بیربکەرەوە و پەند وەربگـرە بەشـێوەیەکی تایبـەت لـە درووسـتکردنی خـۆت لەلایەن پەروەردگارەوە ئەی ئادەمیزاد ، وە بیربکەرەوە لـە سەرەتای دروسـتکردنت و ناوەڕاستی و کۆتاییەکەی بڕوانە بەچاو ڕوونی بۆ سەرەتای درووستبوونت لـە تنۆکێـك لـە ئاوێکی بێنرخی پیس ، چۆن پەروەردگاری هەموو خواکـان[70] لـەنێوان بڕبڕەکـانی پشتی پیاو و سنگی ژندا ، بەملکەچی بۆ دەسـەڵاتی پـەروەردگاری ، لـەسـەر تەسـکی

[70] مەبەست بەخواکان خوا بەتاڵەکانە چونکە هەرخوایەك مرۆڤ پەرستشی بۆبکات جگە لە الله ئەوە پوچ و بەتاڵە – وەرگێڕ .

ڕێگای و جیاوازی ڕێڕەوەکانی هەتا گەیانییە جێی جێنشینی و شوێنی کۆبوونەوەی ، وە چۆن پەروەردگار تەبایی و کۆکی درووست کردووە لەنێوان نێر و مێدا ، وە خۆشەویستی خستۆتەوە نێوانیانەوە ، وە چۆن ڕێکی خستوون لە ڕێگەی ئارەزوو وە خۆشەویستی بۆ کۆبوونەوە ، کە ئائەوەیە هۆکاری درووسبوونی منداڵ و پێکهێنانی ، وە چۆن هاوسەنگی کۆبوونەوەی لەنێوان ئەو دوو ئاوەدا سەنگاندووە لەگەڵ دووری هەریەکەیان لەهاوەڵەکەی ، وە ڕێی پێکردوون و هێناونی لە قولایی دەمارەکان و ئێسکەکانەوە ، وە کۆیکردوونەتەوە لەیەك جێگەدا ، جا ئەو جێگەیە بۆ ئەو دوو ئاوە کراوە بە جێگایەکی پتەو و تۆکمە ، هەوای پێناگات هەتا خراپی بکات ، وە سەرماشی ناگاتێ تا بیبەستێ ، وە هیچ شتێکی تووش نایەت ، پاشان ئەو تنۆکە ئاوە سپیە ڕۆشنە دەبێت بە پارچە خوێنێکی سووری مەیلەو ڕەش ، پاشان دەبێت بە پارچە گۆشتێك ، بە پێچەوانەی پارچە خوێنەکە لە ڕەنگ و بونیەت و شێوەیدا ، پاشان دەبێت بە ئێسقانێکی ڕووت کە پۆشاکی هیچ پێوە نییە ( واتە : نە گۆشت و نە پێست ) جیاواز لە پارچە گۆشتەکەی پێشوو لە شێوە و بوونیەت و ئەندازەو ڕەنگیدا ، وە هەروەها یەك بەدوای یەك چینەکانی درووست بوونی ئادەمیزاد تێپەڕ دەبێت هەتا دەردەچێت بەو شێوەیەی کە پەروەردگار شێوەی کێشاوە لەسەری ، جا گوێ و چاو و دەم و لووت و سەرجەم کونەکانی تری بۆ دەکاتەوە ، وە هەردوو دەستەکانی و قاچەکانیشی بۆ درێژدەکات ، وە سەری دەستەکانی و قاچەکانی بۆ بەشدەکات بە پەنجە ، پاشان سەری پەنجەکانیش بەش دەکات بە سەری پەنجە ، وە ئێسکەکانی ناوەوەشی ڕێکخستووە هەر لە دڵ و گەدە و جگەر و سپڵ و سی و ڕەحم و میزەڵدان و ڕیخۆڵە ، هەر یەکێك لەمانە سەنگێکی تایبەتی هەیە وە تایبەندمەندە بە سوودێکەوە [71] . جا پاکی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بوونەوەری درووست کردووە بە جوانی و ڕێك و پێکی وە بۆ

---

[71] انظر ( مفتاح دار السعادة ) لابن القيم ( ص : ٢٠٥-٢٢٦ ) ، فجميع ما تقدم بدءا من ( ص : ٤٥ ) منقول منه بشئ من التصرف ، و انظر : ( التبيان في أقسام القرآن ) ( ص : ٢٩٥) و ما بعدها ، و ( شفاء العليل ) ( ص : ٦٦ ) و ما بعدها وكلاهما لابن القيم ، و انظر أيضا : ( العظمة ) لأبي شيخ الأصبهاني ( ١:٢٠٩ ) و ما بعدها إلى أواخر المجلد الأول من قوله : باب الأمر بالتفكر في آيات الله عزّوجلّ و قدرته و ملكه و سلطانه و عظمته و وحدانيته .

هەموو شتێك شێوەی ژیانی خۆی و ئەندازە گیری پێبەخشیوە و ڕێنمایشی کردووە ، ئەو پەروەردگارەی کە دەفەرموێت :﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات: ٢١
واتە : لەخودی خۆشتاندا بەڵگە و نیشانەی بوونی پەروەردگار و گەورەیی دەسەڵاتی هەیە کە وابوو نارِوانن و بیرناکەنەوە کە ئێوە چۆن درووست کراوون هەریەکە ڕەنگ و ڕووخسارێکی جیاوازی هەیەو بەجۆرێك قسەدەکات و پلە و پایەو چۆنیەتییەکی جیاوازی هەیە .
جا هەرچی بوونەوەرە لە بچووکترین شتەوە هەتا عەرشی پەروەردگار ڕێگان بۆ لای ناسینی پەروەردگار ، وە بەڵگەی پڕ واتان لەسەر نەمری پەروەردگار و هەمیشە بووونی ، وە هەموو گەردوونیش زمانی گۆدارن بە تاك و تەنهایی پەروەردگار ، وە هەموو جیهانیش نووسەرن پیتەکانی کەسەکان دەخوێنێتەوە ئەوانەی چاو ڕۆشنەکان هەر کەسەو بە ئەندازەی چاو ڕۆشنی خۆی [٧٢] .
جا بیرکردنەوە و تێڕوانین و ووردبوونەوەی چاو و ڕۆشنکردنەوەی بیروهۆش ئالەم نیشانانەو وە غەیری ئەمانەش لەوانەی کە پەروەردگار درووستی کردوون لە گەورەترین ئەو سوودانەیە کە مرۆڤەکان دەگێڕێتەوە بەهێز کردن و دامەزراندنی باوەڕ چونکە لەماوەی ئەو بیرکردنەوەیەدا تاك و تەنهایی درووست کاری و تەواوی بێ عەیبی پادشای خۆی دەناسێت کە خوای پاك و بێگەردە ، ئینجا خۆشەویستی و گەورەیی و ڕێزی پەروەردگار زیاد دەبێت لەلای ، وە گوێڕایەڵی و ملکەچیشی بۆی زیاد دەبێت ، ئائەوە لە گەورەترینی بەروبوومی ئەو ڕوانینەیە .
وە ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : کاتێك بیرتکردەوە لەوەی کە پەروەردگار بەندەکانی بانگ دەکات بۆلای لە بیرکردنەوە لە کتێبەکەیدا ئەوا دەتخاتە ناو زانستەوە بە خوای پەروەردگار ( واتە : پەروەردگارت پێدەناسێنێت : وەرگێڕ ) بە

[٧٢] انظر : ( ذيل طبقات الحنابلة ) لابن رجب ( ١:٣٠٧ ) ، ئەمە لە وتەی عوسمانی کوڕی مەرزوقی قوریشییە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) .

تاك و تەنیاییەکەی وە صیفاتە بەرزەکانی و تەواوی و بێ کەم کوڕی پەروەردگار ، هەر لە تەواوی دەسەڵاتی و زانستی و تەواوی حیکمەتی و سۆزی و چاکەی و بەزیی و دادپەروەری و ڕەزامەندی و توڕەبوونی و پاداشتی و تۆڵەشی ، ئابەمانە پەروەردگار خۆی ناساندووە بە بەندەکانی و هانیشی داون بۆ بیرکردنەوە لە نیشانەکانی [٧٣] .

وە شێخ سەعدی ( ڕحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : لە هۆکارەکانی باوەڕ و داخوازییەکانی بیرکردنەوەیە لە گەردوون ، لە درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی تیایاندایە لە بوونەوەری جۆراوجۆر ، ڕوانین لە ئادەمیزاد وە ئەو صیفاتانەشی کە لەسەریتی ، ئەوە بێگومان بانگخوازێکی گەورەیە بۆ باوەڕ هێنان لەوەی کە هەیە لەم بەدیهێنراوانە لە گەورەیی درووستکردنیان کە بەڵگەن لەسەر بەتوانایی و گەورەیی درووستکەرەکەیان کە پەروەردگارە ، وە لەوەشی کە تیایاندایە لە جوانی و ڕێك و پێکی هاوسەنگی کە عەقڵ و هۆش سەرسام دەکات ، کە بەڵگەن لەسەر فراوانی زانستی خوای پەروەردگار و تەواوی حیکمەتی ، وە لەوەشی کە تیایاندایە لە جۆرەها سوود و ناز و نیعمەتی زۆر کە ژمارە ناکرێن ، کە بەڵگەن لەسەر فراوانی سۆز و ڕەحمەت و چاکە و بەخشندەیی پەروەردگار ، ئائەمانە هەرهەمووی بانگەشە دەکات بۆ بەگەورە دانانی داهێنەرەکەی و درووستکەرەکەی وە سوپاسکردنی و دەم بەیادی ئەو و نییەت پاکی دینداری بۆ ئەو ، ئائەوەیە ڕۆح و نهێنی باوەڕ [٧٤] .

ئالەبەر ئەمانەیە پەروەردگاری بەخشندە بەندەکانی هاندەدات لە کتێبەکەیدا بۆ بیرکردنەوە لەم نیشانەو بەڵگانە ، وە بەنداکانی هاندەدات بۆ ڕوانین و تێڕامان لە چەندین جێگەدا لە کتێبەکەیدا ، ئەوەش لەبەر زۆری سوودەکانی بۆ بەندەکان و گەورەی دواییەکەی بۆ سەریان .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ فَأَحۡيَا بِهِ

[٧٣] ( مفتاح دار السعادة ) لابن القيم ( ص: ٢٠٤ ) .
[٧٤] ( التوضيح و البيان ) ( ص : ٣١ ) ، و انظر ( الرياض الناضرة ) له ( ص : ٢٥٨،٢٨٠ ) .

ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾ البقرة: ١٦٤

واته : بێگومان لە درووستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا وە بەهەموو ئەو ئەستێرە و هەسارەنەشی کەتیایدایە وە زەویش بەهەموو ئەو سوودانەی کەتیایدایە بۆ مرۆڤەکان وە جیاوازی شەو و ڕۆژ جارێك ئەمیان درێژە وە ئەویان کورتە وە بە پێچەوانەشەوە وە لەو کەشتیانەشی کە بەناو دەریاکاندا هاتوچۆ دەکەن بۆ بەرژەوەندی و سوود و قازانج بە خەڵکی بگەیەنن وە لەو ئاوەشدا کە پەروەردگار لە ئاسمان دەیبارێنێت زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای مردن و ووشکبوونی وە هەموو جۆرە زیندەوەرێکی تیادا بلاوکردۆتەوە وە لە جولاندنی باکان و هاتوچۆ پێکردنیان هەرجارەی بەشێوەیەك جارێك گەرمە و وە جارێك ساردە وە هەر جارەی بە لایەکدا هەڵدەکەن وە لەو هەورانەشی کە لەنێوان ئاسمان و زەویدا ڕاگیراون و ملکەچ کراون بەفەرمانی پەروەردگار ، لە هەموو ئەم شتانەی کە باسکرا بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ خەڵکی خاوەن هۆش و ئەوانەی کە بیردەکەنەوە ئا لەم شتانە کە هەمووی بە یاسا درووست کراون .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الروم: ٢٠

واتە : لە نیشانەی گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار ئەوەیە کە باوکە گەورەی ئێوەی لەگڵ درووستکردووە پاشان ئێوەشی لە نەوەی ئەو درووستکردووە پاشان ئێوە دەبن بەم مرۆڤە دوای چینەکانی درووستبوون و بەسەر زەویدا بلاو دەبنەوە .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية: ١٧ - ٢٠

واتە : ئایە بێباوەڕکان و خەڵکی تریش تەماشای وشتر ناکەن چۆن دروستکراوە وە پەروەردگار بەو قەبارە گەورەیەوە وای لێکردووە کە مرۆڤەکان هەڵی سەنگێنن بۆ کار و پێویستی خۆیان ﴿١٧﴾ وە ئایە ناڕوانن بۆ ئاسمان کە چۆن پەروەردگار وەك سەقفێك بەسەریانەوە ڕایگرتووە وە بە ئەستێرەش ڕازاندویێتیەوە وە چەندین سوودی تریشی تێدایە بۆ ئادەمیزاد ﴿١٨﴾ وە بۆ کێوەکان ناڕوانن کە چۆن داکوتراون و لە ناخی زەوی توندکراون ﴿١٩﴾ وە ناڕوانن بۆ زەوی کە چۆن داخراوە و بۆ بوونەوەر جێگیر کراوە ﴿٢٠﴾ .

وە جگە لەمانەش چەندین ئایەتی تریش کە زۆرن لە قورئانی پیرۆزدا کە پەروەردگار تیایاندا بەندەکانی بانگدەکات بۆ ڕوانین لە نیشانە و کارەکانی ، کە گەورەترین بەڵگەن لەسەر تاك و تەنیایی پەروەردگار وە بەڵگەن لەسەر دەسەڵات و بەڕێوەبردن و زانست و چاکە و بەزەیی و بەخشندەیی پەروەردگار ، ئەوەش گەورەترین بانگخوازە بۆ بەندەکان بۆلای خۆشەویستی پەروەردگار و سوپاس کردنی و بەگەورە ڕاگرتنی و گوێڕایەڵی کردنی و پەیوەستبوون بە یادیەوە .

ئابەمە ڕوون دەبێتەوە : کە ڕوانین لە گەردوون و بیرکردنەوە تیایدا لە گەورەترین هۆکارەکانی باوەڕ و بەهێزترینی داواکانێتی .

هۆكاری سێهەم لە بەشی پێنجەم : ـ

## كۆششكردن لە كردەوە چاكەكاندا

كۆششكردن لە كردەوە چاكەكاندا : ئەوەیە كە مرۆڤی موسوڵمان هەوڵبدات بۆ هەستان بە كارە چاكەكان تەنها بۆ خوای پەروەردگار وە زۆر كردەوەی باش بكات و بەردەوامیش بێت لەسەری .

چونكە بێگومان هەموو كردەوەیەك لەوانەی كە پەروەردگار بە شەرع دایناوە وە موسوڵمان پێی هەڵبسێت و دەروون و ویستی پاك بكاتەوە تیایدا ئەوا باوەڕی پێی زیاد دەكات ، چونكە باوەڕ زیاد دەكات بە گوێڕایەڵی زیاتر بۆ پەروەردگار و زیاتر كردنی بەندایەتی .

پاشان ئەو بەندایەتییەی كە پەروەردگار دایناوە بۆ بەندەكانی و داوای لێكردوون كە هەستن پێی لە فەرز و سوونەتی ، دابەش دەبن بەسەر دڵ و زمان و ئەندامەكان ، وە بۆ سەر هەر یەكێكیان بەندایەتی تایبەتی خۆی هەیە .

لە بەندایەنی دڵ كە تایبەتی خۆیەتی : نیەت پاكی و خۆشەویستی و پشت بە خوا بەستن و گەڕانەوە بۆ لای و تكا لێكردنی و ترس و ڕازی بوون و ئارامگری و جگە لەمانەش لە كردەوەكانی دڵ .

وە لە بەندایەتی زمان كە تایبەتی بێت : خوێندنەوەی قورئان و الله أكبر و سبحانه الله و لاإله إلاّ الله و داوای لێبووردن لێكردنی و سوپاس كردنی و وەصفدانێتی وە سەلاّوات دانیشە لەسەر پێغەمبەرەكەی ﷺ وە جگە لەمانەش لەو كردەوانەی كە بەزمان دەكرێت .

وە لە كردەوەكانی كە تایبەتمەندی ئەندامەكانی مرۆڤە : دەستنوێژ گرتن و ڕۆشتن بەرەو مزگەوت و نوێژكردن و چاكە كردن و حەج و وێنەی ئەو كردەوانەی كە بە لاشە دەكرێن .

جا ئەم کردەوانەی کە بە دڵ و زمان و لاشە دەکرێن هەرهەموویان لە باوەڕن بەژدارن تیایدا ، جا هەستان پێیان و زیادکردنیان مایەی باوەڕی زیادەیە وە کەم کردنیان و گوێپێ نەدانیان کەمی باوەڕە .

بەڵام کردەوەکانی دڵ : ئەوە لە ڕاستیدا بنچینەی دین و لوتکەی کارەکان و گرنگترین داخوازییە ، بەڵکو کردەوە دیارە بینراوەکان قبوڵ ناکرێن ئەگەر کردەوەکانی دڵی لەگەڵدا نەبێت ، چونکە بێگومان هەموو کردەوەکان بە مەرج گیراوە لە قبوڵ بوونیان نییەت پاکی بۆ خوای بالاّ دەست ، نییەت پاکیش کردەوەیەکی دڵە ، هەر لەبەر ئەمەیە کردەوەکانی دڵ پێویستە لەسەر هەموو کەسێك ، وازهێنانی چاك نییە لە هیچ دۆخێك لە دۆخەکاندا ، وە خەڵکیش لە هەستان بە کردەوەکانی دڵ لەسەر سێ پلەن هەروەك چۆن لە کردەوەکانی جەستەدا لەسەر سێ پلەن : تیایاندایە کەم تەرخەمە لە کارە باشەکاندا ئەوە ستەم لە خۆی دەکات ئەو جۆری یەکەما وە تیایاندایە مام ناوەندە نە کەم تەرخەمن نە زیادە ڕەویش دەکەن ئەمە دووەم جۆرن وە تیایاندایە کاری باش زۆر دەکەن و لە پێش ڕەوانن ئەمە جۆری سێهەمینیانەو لە هەردوو جۆرەکەی تر باشترە [75] .

هەر لەبەر ئەمەیە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك دەست بکات بە خاوێنکردنەوە و چاکسازی و گوێدان بە دڵی ، پێش ئەوەی کە گوێ بدات بە چاکسازی ڕووکەشی خۆی ، چونکە پەند و ئامۆژگاری نییە لەوەی کە ڕووکەش چاك بێت و بەڵام ناخ پیس و خراپ بێت .

وە هەرکاتێك مرۆڤی موسوڵمان دڵی پاککردەوە بە کردەوە پاکەکان و نییەت پاکی و ڕاستگۆیی و خۆشەویستی پەروەردگار و پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا هەموو ئەندامەکانی جەستەی ڕاست دەوستن و ڕووکەشیشی چاك دەبێت هەروەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە فەرموودەی نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (

---

[75] انظر : ( الفتاوى ) ( ١٠:٦ ) .

ڕەزای خوایان لێبێت ) دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو : ( ... أَلا وَ إِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً إِذا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ ، وَ إِذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّـهُ ، أَلا وَ هِيَ القَلْبُ ) [٧٦] .

واتە : ئاگاداربن بێگومان لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە كاتێك ئەو پارچە گۆشـتە چاكبوو ئەوا جەستە هەمووی چاك دەبێت ، وە ئەگەر كاتێك ئەو پارچە گۆشتە خراپ بوو ئەوا جەستە هەمووی خراپ دەبێت ، ئاگاداربن ئەوە دڵە .

ئالـەم فەرموودەیەدا گەورەترین ئاماژە هەیە كە چاكە ڕووكەشـەكانی هەڵـسووكەوتی بەندە بە گوێرەی چاكی دڵی و ناخێتی ، جا ئەگەر دڵی ساغ و سەلامەت بوو جگە لـە خۆشەویستی پەروەردگار و ئەوەی كە ئەو خۆشی دەوێت و ترسی ئـەو و ترسـان لــە كەوتنە شتێكەوە كە ئەو پێی ناخۆشە ، ئـەوا هەڵـسووكەوتەكانی جەسـتەی هـەمووی چاك دەبێت ، بە پێچەوانەی ئەوەی كاتێك دڵی خراپ و نەخۆش بێت ، خۆشەویـستی هەوا و ئارەزوو شوێن كەوتنی نەفس بازی و پێش خستنی ئەو شتانەی نەفس پێی خۆشە دەستی كێـشابێت بەسـەریدا ، جـا هـەر كەسـێك كـە وابێـت ئـەوا كـار و كـردەوە ڕووكەشەكانی جەستەشی هەمووی خراپ نالەبارە .

هەر لـەبەر ئەمەیە وتراوە : دڵ پادشای ئەندامـەكانی جەسـتەیە ، وە سـەرجەم جەسـتە سەربازی ئەون ، وە لـەگەڵ ئەوشدا گوێڕایەڵی دڵ دەكـەن هەڵدەسـن بـە گوێڕایـەڵی كردنی و جێبەجێكردنی فەرمانەكانی ، لـە هیچ شتێكدا سەرپێچی ناكـەن ، جـا ئەگـەر ئەو پادشایە چاك بێت كە دڵە ئـەوا سـەرجەم سـەربازەكانیش چـاك دەبـن كـە كـۆی جەستەیە ، وە ئەگەر پادشا خراپە كار بێت ئەوا سەرجەم سەربازەكانیش وادەبـن ، وە لای پەروەردگاریش سوودی نییە جگە دڵی ساغ و سەلیم نـەبێت ، هـەروەك خـوای پەروەردگار دەربارەی دەفـەرموێت : ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء: ٨٨ - ٨٩

---

[٧٦] البخاري ( ١٢٦:١ فتح ) ، و مسلم ( ١٢٢٠:٣ ) .

واتە : ئەو ڕۆژە کە ڕۆژی دواییە نە ماڵ و سامان سوود بە مرۆڤەکان دەبەخشێت نە منداڵ بە کەڵك دێن ﴿٨٨﴾ جگە لە کەسێك نەبێت کە بە دڵێکی پاك و ساغ و خاوێنەوە بێت بۆ خزمەتی پەروەردگار .

جا دڵی ساغ و سەلیم : ئەوەیە کە سەلامەت بێت لە هەموو ناهەمواری و شتە قێزەونەکان ، ئەویش ئەو دڵەیە کە بەس خۆشەویستی و ترسی پەروەردگاری تێدا بێت کە دووری بخاتەوە لە خراپە [77] .

وە شیخ لإسلام ابن تيمية ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : دڵ ئەصل و بنچینەیە جا کاتێك خواناسی و ویستی چاکەی تێدا بوو ، ناگونجێت جەستە دوا بکەوێت لەوەی کە دڵ مەبەستێتی ، وە کاتێك دڵ ساغ و سەلیم بوو بەوەی کە تیایدایە لە باوەڕ و زانست و کردەوە دڵییەکان بە پێویستی چاکە خوازی جێگیر دەبێت لە جەستەدا بە وتەی ئاشکراو کردەوە بە باوەڕێکی ڕەها [78] .

هەر لەبەر ئەمەیە کە بێگومان گەورەترینی هۆکار کە باوەڕی مرۆڤەکان زیاد بکات پێی چ لەڕووی ناوەوە وە چ لەڕووکەشیدا ئەوەیە کە کۆششێکی تەواوی نەفسی بکات لەسەر چاککردنی دڵی و بنیادنانی دڵی بە خۆشەویستی پەروەردگار و ئەوانەی کە پەروەردگار پێی خۆشە لە ووتە و کردەوەکان .

حافظ إبن رجب ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : دڵەکان چاکە خوازییان بۆ نییە هەتا ناسین و گەورەیی و خۆشەویستی و ترس و هیوا و پشت بەستن بە پەروەردگاری تیادا جێگیر نەبێت پڕ نەبێت ئالەمانە ، ئائەوە ڕاستی یەکتاپەرستییە ، وە ئەوەیە واتای ـ لا إله إلاّ الله ـ .

وە دڵەکان چاکە خوازییان بۆ نییە هەتا ئەو خوایەی کە ئەو بە خوای دەزانێت و دەیناسێت و خۆشی دەوێت و لێی دەترسێت خوای تاکو تەنیایە کە هیچ هاوەڵێکی نییە وە ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا خوایەك هەبوایە خوایەتی بکردایە جگە لە خوای

---

[77] انظر ( جامع العلوم و الحكم ) لابن رجب ( ص : ٧١ ) .

[78] ( الفتاوى ) ( ٧:١٨٧ ) .

گەورە ئەوا ئاسمانەکان و زەوی تێك دەچوون ، هەروەك خوای گـەورە دەفـەرموێت :
﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴿٢٢﴾ ﴾ الأنبيـاء: ٢٢ . واتە : ئەگەر لـە ئاسمان و زەویدا چەند خوایەك هەبوایە ئەوا ئاسمان و زەوی تێك دەچوو بـەلاَم ڕێکـی و جـوانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشـی کـە تیایاندایـە هـەمووی شـایەتە لەسـەر بـوونی یـەك دروستکەر کە خوای بالاَ دەستە . جا لـەمەوە زانرا کە چاکە خوازی بۆ جیهانی سەرو خوارو نییە هەتا هەرچی کار و جووڵەی هەیە بۆ پەروەردگار نەبێت ، وە جووڵـەکانی جەستەش شوێن کەوتەی جووڵەو ویستی دڵە ، جا ئەگەر جوڵە و هەڵسووکەوتەکەی و ویستەکانی بۆ خوای تاك و تەنیا بێت ئەوا دڵ خۆشی و هەموو ئەندامەکانی جەستەش چاك دەبن ، وە ئەگەر جوڵە و ویستی دڵ بۆ غەیری خوا بوو ئـەوا دڵ و جووڵـەکانی جەستەش هەمووی خراپ دەبێت بە گوێرەی خراپی جوڵەی دڵ [٧٩] .

وە جێگیربووە لـە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی : « مَنْ أَحَبَّ لِلّهِ وَأَبْغَضَ لِلّـهِ وَأَعْطَى لِلّهِ وَمَنَعَ لِلّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ » [٨٠] .

واتە : هەر کەسێك لـەبەر خوا خەڵکی خۆش بوێت وە لـەبەر خواش ڕقـی لــە خـەڵك بێت وە لـەبەر خوا ببەخشێت وە هەر لـەبەر خواش نەبەخشێت ئەوا باوەڕی تەواوە .

وە واتای ئەمە ئەوەیە کە بێگومان هەموو جوڵەکانی دڵ و لاشە کاتێك بۆ خوا بوو ئەوا باوەڕی بەندا تەواوە لـە ڕووی دەرەوەش و ناویشەوە ، وە هەر بە چاکی جوڵەکانی دڵ چاکی جوڵەکانی جەستە جێگیر دەبێت ، وە کاتێك دڵ خۆی چاکبوو وە بەس ویـستی پـەروەردگار و ئەوەشـی کـە پـەروەردگار دەیـەوێت تیایـدا بێـت جەسـتە بـە شـتێك هەڵناسێت جگە لـەوەی کە خوا دەیەوێت وە پەلـەش دەکات بۆ لای ئەوەی کـە خـوا پێی ڕازییە وە خۆشی دەگرێتەوە لـەوەی کە خوا نایەوێت وە لـەوەشی کە ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە لـەوانەیە خوا پێی ناخۆش بێت ئەگەر یەقینیشی نەبێت [٨١] .

---

[٧٩] ( جامع العلوم و الحكم ) ( ص : ٧١ ) ، و انظر ( الوابل الصيب ) لابن القيم ( ص : ١٢ ) .
[٨٠] رواه أبو داود ( ٤:٢٢٠ ) ، و الطبراني في الكبير رقم ( ٧٧٣٧ ) ، و ابن بطة في الإبانة ( ٢:٦٥٨ ) و غيرهم ، و صححه الألباني ، انظر ( السلسلة الصحيحة ) ( ١:٦٥٧ ) .
[٨١] ( جامع العلوم و الحكم ) ( ص : ٧٢ ) .

وە هەر کاتێك دڵەکان چاکبوون بە باوەڕ و ڕاستگۆیی و نیەت پاکی و خۆشەویستی بۆ خواو وە هیچ ویستێکی تیادانەما جگە لە ویست نەبێت بۆ پەروەردگار ، ئەوا هەموو بەشەکانی جەستەش چاك دەبن ، هیچ جوڵەیەك ناکات بۆ خوای گەورە نەبێت وە ئەوەشی کە خوا لێی ڕازییە .

وە دڵ بەتاڵ نییە لە دۆخێك لە بیرکردنەوە ، یان بیرکردنەوەی لە چاکسازی و پێویستییەکانی دوارۆژی ، وە یاخود لە دۆخی بیرکردنەوەی پێویستییەکانی دنیا و بەرژەوەندییەکانی ، وە یاخود لە دۆخی دودڵی و گومان و هیوا و ئاواتی بەتاڵدان لەگەڵ چارەنووسی گریمانەیی .

وە کۆی چاکسازی دڵ ئەوەیە کە خەریکی کەیت بەوەوەی کە چاکی و سەرفرازییەکە زانراوی تێدابێت ، لە ڕووانگەی زانستەکانەوە خەریکی بکەیت بەوەوەی کە ناسینی پێویستە لەسەرت وەك یەکتا پەرستی و مافەکانی ، وە بە ناسینی مردن و ئەوەشی کە دوای مردنە کە چوونە بەهەشتە یاخود دۆزەخ ، وە لەڕووانگەی ویست و مەبەستەکانەوە خەریکی بکەیت بەو ویستانەوەی کە سوودت پێدەگەیەنێت وە ئەو ویستانەشی کە زیانت پێدەگەیەنێت لەخۆتی دووربخەیتەوە [٨٢] .

وە بێگومان گەورەترین کۆمەك بۆ بەندە بۆ زیادچاکردنی دڵی هەستکردن و درککردن بە پێشبینی سوود بەخش لە دڵیدا بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی خۆی بە پەروەردگارەوە ، وە بێگومان کردەوە چاکەکان بە گوێرەی هەستانی ئەو پێشبینیانە و زۆر بوونیان دەبێت لە دڵیدا .

پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ئێمە بەیارمەتی پەروەردگار ئاماژە دەدەین بەو کارانە و ئەو پێشبینیانەی کە لەدڵدا دەبێت هەبێت بۆ ئەوەی ڕاستی ئەم کارە بزانرێت : یەکەم دانە بۆ ئەو کەسەی کە بەرەو لای پەروەردگار و دوارۆژ دەڕوات : ئەویە کە لە دڵیدا کەم نرخی دونیاو بێوەفایی و زۆری دڵڕەقێکەی و

[٨٢] انظر ( الفوائد ) لابن القیم ( ص : ٣١٠،٣١١ ) .

فەرامۆشیەکەی و بێنرخی هاوەڵێتی و خێرایی جیابوونەوەکەی درووست بکـات ، جـا کاتێك لـە دڵی بەندەدا ئەم ڕێبەرە دروست بوو ئەوە دڵی لـە دونیا کۆچ دەکـات وە دەڕوات بەرەو داواکردنی دوارۆژ ، وە لـەو کاتەدا ڕێبـەرێك لــە دڵیـدا هەڵدەسـێت بەوەی کە بەرەو بـەردەوامی بـەرێت بـەرەودوارۆژ ، چـونکە بەڕاسـتی دوارۆژ جێـی حەوانەوەیە ، خەڵکەکەی نە لـەوێ بار دەکەن وە نە بۆ ماوەیـەکی کـورتیش دەڕۆن ، بەڵکو ئەوێ ئارامگەیە ، وە وێستگەیە بۆ بارکردن بۆلای ، وە کۆتایی بار و ڕۆشتنە ، پاشـان لـــە دڵیـــدا وێنەیـــەك و ڕێبـــەرێك هەســتێت لـــە وێنـــە و ڕێبـــەری ئــاگر و سووتەمەنییەکەی و سووتاننکەی و دووری بنەکەی و تینی گەرمییەکـەی و گـەورەیی ئەشکەنجەی ئەو خەڵکەی کە تیایدایە ، بیان بینێت کە دەبرێن بـەرەو لای ، بـە دەم و چاوی ڕەشو چاوی شینەوە و کۆت و زنجیر لـە ملان کراو ، وە کاتێك دەگەینرێنە لای دەرگاکانی دەکرێتەوە بە دەم وچاویاندا ، ئائەو دیمەنە ترسناکە دەبینن ، دڵیـان پارچـە پارچە دەبێت لـە داخ و خەم و پەژارەدا .

جا کاتێك لـە دڵدا ئەم هەستە درووستبوو ئەوا خۆی دادەڕنێت لـە تاوانەکان و شـوێن کەوتنی ئارەزووەکان ، وە پۆشاکی تـرس و بـە ئاگـایی دەپۆشـێت ، بـەگوێرەی ئـەو هەستەی کە لـە دڵیدا درووست بووە دوای گوناهکاری تاوان و سەرپێـچییەکان ، وە ئـەو هەسـتە هەرچـی تـاوان و کەرەسـتە لـەناوبـەرەکان لــە دڵیــدا دەیتوێنێتـەوە وە دەیگەیەنێت و پاشان دەری دەکاتە دەرەوە ، ئەوکاتە دڵ لـەزەت و خۆشی و سەلامەتی دەست دەکەوێت .

جا دوای ئەوە هەسـتی بەهەشـت درووسـت دەبێـت ، وە ئەوەشـی کـە پـەروەردگار ئامادەی کردووە تیایدا بۆ خەڵکەکەی ، لـەوانـەی کـە نـە چـاو دیوێـت و نـە گـوێ بیستوێتی و نە هاتووە بـە دڵ و هۆشـی هـیچ کەسـێکدا ، کـەمتر لـەوەش نایـەت بـە خەیاڵیاندا کە پەروەردگار وەصفی کردووە لـەسەر زمانە پێغەمبەرەکەی ﷺ لـە نـاز و نیعمەتە زۆرەکان ، هاو وێنە بە بەرزترین جۆرەکانی تام و چێژ ، هـەر لــە خـواردن و خواردنەوە و پۆشاك و دیمەن و خۆشی و شادی .

وە لە دڵیدا هەستی ماڵێك درووست دەبێت كە پەروەردگار كردویێتی بە شوێنی پڕ ناز و نیعمەتی بێ كۆتایی بەوەشیەوە كە تیایدایە ، گڵەكەی بۆنی میسكە وە بەردەكانی گەوهەر و مرواریە وە خانووەكانی خشتی زێڕ و زیو و قامیشە لە مرواری ، وە خواردنەوەكانی شیرینترە لە هەنگوین و بۆنخۆشترە لە میسك و ساردترە لە كافور و بەتام ترە لە زەنجەفیل ، وە ئەگەر یەكێك لە ئافرەتەكانی دەموچاوی دەركەوێت لەم دونیایەدا ئەوا ڕۆشناییەكەی ڕۆشنایی خۆر دادەپۆشێت ، وە پۆشاكەكانیان پێك هاتووە لە ( سندس : كە پۆشاكێكی نەرم نۆڵە ، وە بەسەریشیدا إستبرق لەبەر دەكەن كە لە سندس پتەو ترە ) ، وە خزمەتكارەكانیان لاوانێكن هەروەك مرواری بڵاوبۆوە وان ، وە میوەهات بۆیان بەردەوامە هەرگیز نە دەبڕێت و نە قەدەغە دەكرێت ، وە ڕاخەرەكانە بەز و نەرم و نیانە ، وە خۆاكیان گۆشتی باڵندەیەكە كە خۆیان حەزیان لێبێت ، وە خواردنەوەیان نە سەریان پێدەداتە ئازار و نە پێشی سەرخۆش دەبن ، وە سەوزەكانی كە دەیخۆن لەوانەیە كە خۆیان هەڵیدەبژێرن ، وە بەرچاویشیان حۆری چاو گەوریە هەروەك مرواری پارێزراوە ، وە لەسەر چەند تەخت و قەنەفەیەك پاڵیان داوەتەوە ، وە لەو باخچانەدا ڕیزلێگیراون ، وە لەوێ ئەوەی نەفس حەزی لێبكات و چاو پێی خۆش بێت و لەزەتی لێوەربگرێت هەیە ، وە لەوێ بێكۆتایی دەمێننەوە .

جا كاتێك ئەم هەستە لە دڵیدا جێگیربوو حەز و هەستی بۆ درووست دەبێت بۆ ڕۆژی بینینی پەروەردگار ڕوانین بۆ وەجهی خوای پەروەردگار و بیستنی فەرموودەی پەروەردگار بە ڕاستەوخۆیی و بەبێ هیچ نێوەندێك ، جاكاتێك ئەم هەستە و هەستەكانی پێشوو درووست بوو ئەوا دڵ دەڕوات بەرەو لای پەروەردگاری خێراتر لە ڕۆشتنی باكان بەرەو جێگەی خۆیان ، وە ئاوڕناداتەوە لە ڕێگادا نە بەلای ڕاست و نە بەلای چەپیشدا [٨٣] .

---

[٨٣] ( مدارج السالكين ) ( ٣ : ٢٥٠ ـ ٢٥٢ ) .

جا کاتێك لە دڵی بەندەدا وێنەی ئەم هەستانە درووست بوو ، وە بیریشی خستە کار تیایدا ، ئەوا گەورەترین یارمەتیدەر دەبێت بۆی بۆ پاکردنەوە و خاوێنکردنەوەی دڵی لە وەصفە خراپ و ویستە بێنرخەکان و بەتاڵکردنەوەی لە پەیوەستبوون بە غەیری پەروەردگارەوە ، وە گەورەترین هۆش دەبێت بۆی بۆ پەرستن و خۆشەویستی و ترس و گەڕانەوە و هەژاری بۆ پەروەردگار .

مەبەست لەمانە ئەوەیە : کە بێگومان گەورەترین هۆکار بۆ باوەڕ و بەسوودترین هۆیەکانی بەهێزبوونی و گرنگترین هۆکارەکانی زیادبوونی ، چاککردنی دڵە بە باوەڕ و خۆشەویستی خوای پەروەردگار و پاشان پێغەمبەرەکەیی و ﷺ وە ئەوەشی کە خوا و پێغەمبەرەکەیی ﷺ خۆشیان دەوێت ، وە پاکردنەوەی دڵی لەو شتانەی پێچەوانەی ئەمانەیە . پەروەردگار ڕێنیشاندەرە .

وە کردەوەکانی زمان : وەك یادی خوای باڵا دەست و سوپاسی و وەصف کردنی و خوێندنەوەی قورئان و سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەرەی خواو ﷺ ، فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری کردن لە خراپە و ، تەسبیحات و داوای لێبوردن و پاڕانەوە و وە هەموو ئەو کردەوانەی کە بەزمان دەکرێت ، بێگومان کردنی و بەردەوام بوون لەسەری و زۆر کردنیان یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ .

شیخ سەعدی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : لە هۆکارەکانی نیشانەکانی باوەڕ : زۆر یادی خوا کردنە لەهەموو کاتێکدا ، وە پاڕانەوەیە کە پاڕانەوە مۆخی بەندایەتییە ، چونکە بێگومان زیکری خوای پەروەردگار داری باوەڕ دەنێژێت لە دڵدا و دەبێت بەخۆراك بۆی و نشەونەمای پێدەکات ، وە هەتا بەندە زیاتر یادی خوای گەورە بکات باوەڕی بە هێزتر دەبێت ، هەروەك چۆن باوەڕ خۆی بۆ خۆی بانگەشەی زیکر و یادی خوای گەورە دەکات ، جا هەرکەسێك خوای گەورەی خۆش بوێت ئەوا

زیاتر زیکر و یادی دەکات ، وە خۆشەویستی پەروەردگار خۆی بۆ خۆی باوەڕە بەڵکو ڕۆحیەتی [٨٤] .

وە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە کتێبی ( الوابل الصیب ) دا : دەفەرموێت : زیکر و یادی پەروەردگار سەد سوودی هەیە وە حەفتا و سێدانەی لێ باسکردووە [٨٥] : لەوانە : شەیتان ڕاو دەنێت و دەبێتە هۆی ڕەزامەنی پەروەردگار و غەم و پەژارە لادەبات و خۆشی و شادی دەهێنێت و دڵ و جەستە بەهێز دەکات و دەم و چاو و دڵ ڕۆشن دەکاتەوە و ڕزق ڕۆزیش پێی زیاد دەبێت ، وە جگە لەمانەش چەندین سوودی گەورەی ترکە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) باسی کردووە بەبۆنەی زیکر و یادی خوای پەروەردگارەوە بەدەست دێت .

بێگومان گەورەترین و بەهێزترین سوودەکانی خوای بالاّ دەست ئەوەیە کە باوەڕ پێی زیاد دەکات و بەهێز و دامازراویش دەبێت ، هەر لەبەر ئەمەیە چەندین دەق لە کتاب و سونەدا هاتووە دەربارەی فەرمان کردن بە زیکر و هاندان لەسەری و ڕوونکردنەوەی گەورەیی و گرنگی زیکر کردن .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾﴾ الجمعة: ١٠

واتە : یاد و زیکری خوای پەروەردگار زۆر بکەن بە ئومێدی ئەوەی کە سەرفراز و بەختەوەر بن .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾ الأحزاب: ٣٥

واتە : ئەو پیاو و ژنانەی کە زۆر یاد و زیکری پەروەردگار دەکەن خوای گەورە لێخۆشبوون و پاداشتی زۆر گەورەی بۆ ئامادە کردوون .

---

[٨٤] ( التوضيح و البيان ) ( ص : ٣٢ ) .

[٨٥] انظر ( الوابل الصيب ) ( ص : ٨٤ ) وما بعدها .

وه خـوای گـهوره دهفـهرموێت : ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال : ٢

واته : باوهڕدارانی ڕاستهقینه ئهوانهن ههر که ناوی خوا هێنرا دڵیـان لـهبـهر گـهورهی پهروهردگار دهکهوێته ترس و لـهرزه .

وه خـوای گـهوره دهفـهرموێت : ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد: ٢٨

واته : باش بزانن و ئاگادار بن که بهیادی خوای گهوره دڵهکان ئـارام دهبـن و ئـۆقره دهگرن .

وه لـه صـهحیحی موسلیمدا هاتووه لـه فـهرمووده‌ی ئـهبو هـورهیرهدا ( ڕهزای خـوای لێبێت ) که فهرمویهتی : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهِ –صـلى الله عليـه وسـلم– يَسِيرُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ جُمْدَانُ فَقَـالَ (( سِـيرُوا هَـذَا جُمْـدَانُ سَـبَقَ الْمُفَرِّدُونَ )) . قِيـلَ : وَمَـا الْمُفَـرِّدُونَ يَـا رَسُـولَ اللهِ ؟ قَـالَ : (( الـذَّاكِرُونَ اللهَ كَـثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ )) [٨٦] .

واته : ئهبو هورهیره ( ڕهزای خوای لێبێت ) فهرمویهتی : پێغهمبهری خـوا ﷺ دهڕۆی به ڕێگایهکی مهککهدا ، جا ڕۆی بهلای کێوێکدا پێی دهوتـرا (جُمْـدَان ) فـهرمووی : بڕۆن ئهوه جومدانه موفهریدوون پێشکهوتن ، وترا موفهریدوون کێن ئـهی پێغهمبـهری خوا ﷺ ؟ فهرمووی : ئهو پیاو و ژنانهن که زیکـر و یـادی خـوای پـهروهردگار زۆر دهکهن .

وه لهفهرمووده‌ی ئهبو دهردائدا ( ڕهزای خوای لێبێت ) هاتووه کـه پێغهمبـهری خـوا ﷺ فهرموویهتی : (( أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَـالِكُمْ وَ أَرْضَـاهَا عِنْـدَ مَلِـيكِكُمْ وَأَرْفَعِهَـا فِـي

[٨٦] مسلم ( ٤ : ٢٠٦٢ ) .

دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَـاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟ قَالُوا وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ ؟ قَالَ : ذِكْرُ اللهِ )) [٨٧] .

واته : ئایه هەواڵتان بەمێ بە کام کردەوەیەتان کە چاکە و زۆر جێی ڕەزامەندییـە لای خاوەنەکەتان ( کە پەروەردگارە ) وە بەرزترینیانە لـە پلەوپایـەتان و وە چـاکترە لـە بەخشینی زێڕ و زیو وە باشترە بۆتان لەوەی کە بگەن بە دوژمـن و ئێـوە لەگـەردنیان بدەن و ئەوانیش لە گەردنتان بدەن ؟ وتیان ئەوە کامەیە ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ؟ فەرمویی : زیکر و یادی خوای پەروەردگار .

وَ ذَكَرَ عَبْدِ اللهِ بنِ بُسْرٍ رضي الله عنه أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ شَرَائِعَ الإِيمَانِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بـهِ ، قَـالَ : (( لا يَـزَالُ لِـسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ )) [٨٨] .

واته : عەبدولڵای کوڕی بوسر ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرموێ : پیاوێك وتـی ئـەی پێغەمبەری خوا ﷺ یاساکانی باوەڕ کەڵەکە بووە لەسەرم هـەواڵم بـدەرێ بـە شـتێك دەستی پێوە بگرم ، فەرموی : هەمیشە زمانت با تـەڕ بێـت بـە زیکـر و یـادی خـوای پەروەردگار .

وَ فِي (( الصحيحين )) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُـولُ اللهِ صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ : (( يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَ تَعَالَى أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُـهُ فِـي مَلَـإٍ خَيْـرٍ مِـنْهُمْ ... )) [٨٩] . الحديث .

---

[٨٧] رواه أحمد ( ٥ : ١٩٥ ) ، و ابن ماجه ( ٢ : ١٢٤٥ ) ، و الترمذى ( ٥ : ٤٥٩ ) ، و الطبرانى في ( الدعاء ) ( ٣ : ١٦٣٦ ) ، و الحاكم ( ١ : ٤٩٦ ) ، و أبو نعيم في ( الحلية ) ( ٢ : ١٢ ) ، و البغوى في ( شرح السنة ) ( ٥ : ١٥ ) و نكره المنذرى في ( الترغيب و الترهيب ) ( ٢ : ٣٩٥ ) من طرق عن زياد بن أبي بحرية عن أبي الدرداء مرفوعا . و قال الحاكم ( هذا الحديث صحيح الإسناد ، و لم يخرجاه ) ، و وافقه الذهبي ، و قال ابن عبد البر : ( و هذا يروى من طرق جيدة ) ، ( التمهيد ) ( ٦ : ٥٧ ) ، و حسّن إسناده : البغوى و المنذرى .

[٨٨] رواه ابن أبي شيبة ( ١٠: ٣٠١ ) و ( ١٣: ٤٥٧ ) ، و الترمذي ( ٥ : ٤٥٨ ) ، و ابن ماجه ( ٢ : ١٢٤٦ ) ، و الحاكم (١: ١٩٥) . و قال الترمذي : (( حديث حسن من هذا الوجه )) ، و قال الحاكم (( هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه )) و وافقه الذهبي ، و قال الألباني في تخريج الكلم الطيب ( ص : ٢٥ ) : ( صحيح الإسناد ) .

[٨٩] رواه البخارى ( ١٣ : ٣٨٤ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤ : ٢٠٦١ ) .

واته : لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە ، لە ئەبو هورەیرەوە ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : خـوای بـەرز و بـالاّ دەسـت فەرموویەتی : من لای ئەو گومانەدام کە بەندەکەم پێم دەبات وە لەگەڵیشیدام کاتێك یادم دەکات جا ئەگەر یادم بکات لە نەفسی خۆیدا ئەوا منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکیشدا باسم بکات ئەوا من لە کۆمەڵێکدا باسی دەکەم لەوان باشتر بێت .

وە جگە لەمانش چەندین دەقـی تـر هـاتووە کـە بەڵگـەن لەسـەر گـەورەیی زیکـر و گرنگییەکەی و گەورەیی خۆ خەریك کردن پێوەی .

وە ئەگەر هاتوو مرۆڤەکان پشتیان لەم هەموو کارە هەڵکرد و زمانیان خەریك نـەکرد بە زیکری خوای پەروەردگارەوە ، ئەوا زمـانی خـەریك دەبێـت بـە شـتی تـرەوە وەك غەیبەت و دوو زمانی و گاڵتە و سۆعبەت و درۆ و قسەی خراپ و بێ واتا ، چـونکە بەندە پێویستە قسە هەر بکات ، ئەگەر ووتەی سەر زمانی زیکر و یـادی پـەروەردگار نەبێت ، ئەوا یەکێکە لەوانەی تر .

ابن القیم ( ڕەحمەتە خوای لێبێت ) دەفەرموێت : زمان هەرگیز بێدەنگ نابێت ، جا یان زمانێکی هەمیشە بە زیکرە ، یاخود زمانێکە قسەی پڕوپووچ دەکات ، هەر یەکێك لەم دووانەیە ، زمان وەك نەفس وایە ، ئەگەر خەریکی نەکەیت بە حەق و ڕاستییەوە ئـەوا خەریکت دەکات بە بەتاڵەوە ، وە هەروەها زمان وەك دڵ وایە ، ئەگەر خۆشەویـستی خوای گەورەی تیادا جێگیر نەکـەیت ئـەوا بـێ پـێچ و پـەنا خۆشەویـستی درووسـت کراوەکانی تیادا جێگیر دەبێت ، ئەوە زمانە ئەگەر خەریکی نەکەیت بە زیکر و یادی پەروەردگارەوە ، خەریکت دەکات بە قسەی پڕوپووچ و بێ واتا ، ئـەوە بـە پێویـستی بەسەرتەوەیە ، جا یەکێك لەم دوو ئاراستەیە هەڵبژێرە بۆ خۆت ، وە جێگیری بکە لـە یەکێك لەم دوو جێگایەدا [٩٠] .

---

[٩٠] ( الوابل الصیب ) ( ص : ١٦٦ ، ١٦٧ ) ، و انظر أیضا ( ص : ٨٧ ) .

وه کردەوەکانی ئەندامەکانی جەستە : هەر لە نوێژ و ڕۆژو حەج و زەکات و جیهاد و جگە لەمانەش لەو کردەوانەی کە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارە ، ئەوانەش هۆکاری زیاد بوونی باوەڕن .

جا کۆشش کردن لە هەستان بەو کارانەی کە جێی ڕەزامەندی پەروەردگارە و خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر بەندەکانی و وە هەستان بەو کارانەی کە پەروەردگار بەندەکانی هانداوە بۆی ، وە چوون بە پێشوێنیەوە بە جوانترین و تەواوترین شێوە لە گەورەترین هۆکارەکانی بەهێز بوون و زیاد بوونی باوەڕە .

خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾﴾ المؤمنون: ١ - ١١ .

واتە : بە ڕاستی بڕواداران سەرکەوتوو سەر فراز بوون چونکە خاوەنی ئەم صیفاتانەن کە خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێت ﴿١﴾ ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن و هەمیشە بە ترسەوە نوێژ دەکەن و بەرامبەر بە خوای گەورە بەشەرم و حەیان ﴿٢﴾ وە هەروەها ئەوانەشن کە کە لە بەرامبەر کار و قسەی پڕوپووچدا ڕوو وەر دەچەرخێنن و پشت هەڵدەکەن ﴿٣﴾ وە هەروەها بە فەقیر و هەژارەکان زەکات دەدەن ﴿٤﴾ ئەوانەشن کە داوێنی خۆیان لە هەموو کارە ناشەرعی و قەدەغە کراوەکان دەپارێزن و لە جێبەجێ کردنی ئارەزووەکانیان بە نا شەرعیانە خۆڕاگرن ﴿٥﴾ مەگەر لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانی خۆیاندا نەبێت جا بێگومان ئەوان لەو

ڕێگایەوە لۆمە کراو نابن و لێیان ناگیرێت ﴿٦﴾ جا هەر کەسێك لە غەیری ئەم دوو ڕێگایە هەوڵ بدات بۆ بەجێهێنانی ئارەزووەکانی ئەوا سنوور بەزێنەو لە یاسای شەرع لای داوە جا بە هەرچی شێوازێك ئارەزووی خۆی تێر کردبێت ﴿٧﴾ وە ئەوانەشن کە بایەخ بەو سپاردە و پەیمانەنە دەدەن کە داویانەو دەیپارێزن ﴿٨﴾ وە ئەوانەشن کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن و دەپارێزن و تەمەڵی تیادا ناکەن و نایان فەوتێنن و لەکاتی خۆیدا جێبەجێیان دەکەن وەك خۆی ﴿٩﴾ هەر ئائەوانە میراتگران و خاوەنی بەهەشتن ﴿١٠﴾ ئەوانەن میراتگرانی بەهەشت بە هەتا هەتایش تیایدا دەمێننەوە ﴿١١﴾ .

هەر یەکێك لەم هەشت صیفاتە بەروبوومی باوەڕ دەگرێت و نشەونمای پێدەکات ، هەروەك چۆن لە صیفاتی باوەڕن و وە باوەڕیش داخڵی واتاکەیەتی .

ئامادەبوونی دڵ لە نوێژدا وە بوونی نوێژ خوێن کۆششی نەفسی خۆی دەکات بۆ ئامادەبوونی خۆی دەربارەی ئەوەی دەیڵێت و دەیکات لە ووتە و کردەوەی نوێژ هەر لە قوڕئان خوێندن و زیکر و پاڕانەوە ، لە وەستان و تەحیات و ڕکوع و کڕنووشدا ، لە هۆکارەکانی زیاد بوون و نشەونمای باوەڕن .

چونکە بێگومان خوای پەروەردگار نوێژی ناو ناوە باوەڕ هەر وەك خۆی دەفەرموێت :

﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة: ١٤٣

واتە : بێگومان خوای پەروەردگار نوێژەکانتان بەفیڕۆ نادات و پاداشتان نەداتەوە .

وە دەفەرموێت : ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٤٥﴾﴾ العنكبوت: ٤٥

واتە : بە بەردەوامی و ڕێك و پێکی هەستە نوێژەکانت ئەنجام بدە چونکە بەڕاستی نوێژی تەواو تێرو تەسەل مرۆڤەکان لە کاری ناپەسەند گوناه و تاوان دوور دەخاتەوە وە بێگومان یادی خوای گەورە لە هەموو شتێك گەورەترە .

نوێژ کردن گەورەترین ڕێگری کارە لە هەموو کار و ووتەیەکی ناپەسەند کە لابەری باوەڕە ، هەروەك چۆن زیکر و یادی خوای پەروەردگاری لەخۆگرتووە ئەو زیکر و یادەی کە باوەڕ بەهێز دەکات و نشەونمای پێدەبەخشێت ، لەبەر ئەم ووتەیەی کە دەفەرموێت : ﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ﴾ .

وە زەکاتیش بەهەمان شێوە ، باوەڕ پێی زیاد دەکات و نشەونمای پێدەکات ، جا چ زەکاتی فەرز بێت یاخود خێری سوونەت بێت ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (( الصَّدَقَةُ بُرْهَان )) [91] .

واتە : خێرکردن بەڵگەیە .

واتە : خێرکردن بەڵگەیە ((ڕۆشناییە)) لەسەر باوەڕی خاوەنەکەی ، وە بەڵگەی باوەڕەوە هەروەها نشەونماشی پێدەکات .

وە پشتکردنە قسە و کردەوەی چەوت و بێ واتا : ئەو قسانەی کە هیچ خێرێکی تیادا نییە ، وە هەموو کردەوەیەکیش کە خێری تیادا نییە ، بەڵکو ووتەی باش دەڵێن و کردەوەی چاك دەکەن ، وە واز لە قسە و کردەوەی خراپ دەهێنن ، گومانی تێدا نییە کە ئەمانە هەمووی باوەڕ پێی زیاد دەکات بەروبوومی پێدەگرێت .

هەر لەبەر ئەمەیە کە هاوەڵای پێغەمبەری خوا ﷺ ( ڕەزای خوایان لێبێت ) کاتێك تووشی بێ ئاگایی ببوونایە یاخود باوەڕیان کەمی بکردایە ، هەندێکیان بەهەندێکی تریان دەوت : ( إِجْلِسْ بِنَا نُؤْمِنْ سَاعَةً ) .

واتە : وەرن بابەیەکەوە دابنیشین با ساتێکی پڕ لە ئیمان بەسەر بەرین .

جا یادی خوای پەروەردگار و یادی ناز و نیعمەتە دینی دونیاییەکانی پەروەردگاریان دەکردەوە ، ئا بەوە باوەڕیان نوێ دەکردەوە .

وە هەروەها خۆ پاك ڕاگرتن لە کارە ناپەسەندەکان ، بە تایبەتی لە داوێن پیسی ، کە بێگومان ئەوە لە گەورەترین نیشانەکانی باوەڕ و نشەونمایەتی ، مرۆڤی باوەڕدار

---

[91] جزء من حديث أخرجه مسلم ( ١ : ٢٠٣ ) من حديث أبي مالك الأشعري ( رضي الله عنه ) .

لەترسی وەستانی لەبەردەم خوای بالاّ دەستدا : ﴿وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠﴾ النازعات: ٤٠ . چی دەکات ؟ جلّەوی نەفسی لە هەوا و ئارەزووەکان دەگریتەوە ، لەبەر خاتری وەلاّمدانەوەی بانگەشەی باوەڕ وە بۆ بەهێز کردنی ئەو باوەڕەی کە هەیەتی .

وە چاودێرکردن و پاراستنی ئەمانەت و پەیمانەکان لە نیشانەکانی باوەڕە ، هەروەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (( لا إِمَانَ لِمَنْ لا أَمَانَةَ لَهُ )) [٩٢] .

واتە : ئەو کەسەی کە ئەمانەت نەپارێزێت ئەوا باوەڕی تەواو نییە .

جا کاتێك ویستت کە باوەڕ و دینی بەندەیەك بناسیت ، ئەوا بڕوانە بار و دۆخی بزانە ئایە ڕەچاو وچاودێری هەموو ئەمانەتێك دەکات ، چ ماڵی بێت یاخود ووتە ، یاخود ئەمانەتەکانی کە مافن جا چ بەسەر خۆیەوە یان بەسەر خەڵکەوە ؟ وە ئایە ڕەچاوی ماف و پەیمان و گرێ بەستەکان دەکات کە لە نێوان خۆی و خوای گەورەدا هەیە وە ئەوانەشی کە لە نێوان خۆی و هەموو کەسێکی تردا هەیە ؟ جا ئەگەر ڕەچاو و چاودێری کرد ئەوا ئەو کەسە خاوەنی ئاین و باوەڕە ، وە ئەگەر وانەبوو ئەوا بەئەندازەی کەمتەرخەمی کردنی لە پاراستنی ئەمانەتەکان ئەوندە لە ئاین و باوەڕی کەم و نوقسانە .

پاشان خوای گەورە کۆتایی بە وەصفەکان هێنا بە پاراستنی نوێژەکان پاراستنی سنوورەکانیان و مافەکانیان و کاتەکانیان ، چونکە پاراستنی نوێژ وەك ئەو ئاوە وایە کە بە بێستانی باوەڕدا دێ و دەڕوا جا ئاو داشتەی دەکات و نشەونماشی پێدەکات ، وە بەروبوومەکەشی لە هەموو کاتێکدا دێت .

---

[٩٢] أخرجه أحمد ( ٣ : ١٣٥ ) ، و ابن أبي شيبة في مصنفه ( ١١ : ١١ ) و في الإيمان ( ص : ٥ ) ، و ابن حبان في صحيحه ( ١ : ١٠٨ ـ الإحسان ) ، و البغوي في شرح السنة ( ١ : ٧٥ ) ، و قال البغوي : (( هذا حديث حسن )) ، و صححه الألباني في تحقيقه للإيمان لابن أبي شيبة .

وه داری باوەڕ هەموو کاتێك پێویستی بە بەردەوامی هەیە لەسەر ئاودان ، ئەی ئاو دانەکەی چییە ؟ ئەویش پاراستنی کردەوەکانی شەو و ڕۆژە لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگار و بەندایەتی کردنی .

وه پێویستی بە لادانی ئەو شتانە هەیە کە زیانی پێدەگەیەنێت لە تاشە بەرد و لەنگەرە زەرەرمەندەکانی بەردەمی ، ئەویش ، خۆگردتنەوەو خۆ پاك ڕاگرتنە لە شتە حەرامەکان جا چ ووتە بێت یاخود کردەوە .

جا هەرکاتێك ئەم کارانە هاتە جێ ئەوا ئەو بێستانە زیندوو دەبێتەوە و دەگەشێتەوە ، وە چەندین جۆر بەروبوومی جۆراو جۆر دەردەکات [٩٣] .

ئابەم ڕوونکردنەوەیە بۆمان دەردەکەوێت بەهێزی کردەوەی چاك بۆ زیاد بوونی باوەڕ وە هەستان بە کردەوەی چاك و زۆر کردنی هۆیەکی گەورەیە لە هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ .

شیخ الإسلام دەفەرموێت : تەواوی باوەڕ ئەمەیە : کردنی ئەوەی کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێکردووە ، وە وازهێنان لەوەشی کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ قەدەغەیان کردووە ، جا کاتێك وازی هێنا لە هەندێك کاری فەرمان پێکراو وە قەرەبووی کردەوە بە وازهێنان لە کردنی هەندێکیش لە قەدەغەکراوەکان ، ئەوا کەم و کورتی هەیە لە باوەڕەکەیدا بە ئەندازەی ئەوە [٩٤] .

جا چ نوێژ و حەج و خێر و جیهاد و وە هەموو ئەوانەی کە پەروەردگار فەرمانی کردووە بە بەندەکانی هەمووی باوەڕە ، کاتێك بەندە پێیان هەستێت و ئەنجامیان بدات ئەوا باوەڕی زیاد دەکات ، چونکە جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگار هۆیە بۆ زیاد بوونی باوەڕ بەڵام بە دوو مەرج ١ـ نیەت پاکی ، الإخلاص ـ ٢ ـ بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە و وە پێغەمبەرەکەشی ﷺ ئەنجامی داوە ، المتابعة .

---

[٩٣] ( التوضيح و البيان ) لابن السعدي ( ٣٤ ـ ٣٦ ) بتصرف يسير .
[٩٤] ( الفتاوى ) لابن تيمية ( ٢٧ : ١٧٢ ) .

وە محمد بن صالح بن عثيمين ( رحمه الله ) دەفەرموێت : بۆ زیاد بوونی باوەڕ چەند هۆیەك هەیە ، یەك لەوانە ، گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانەی کە پێتکراوە ، چونکە باوەڕ زیاد دەبێت بەگوێرەی جوانی کردەوەکە و جۆرەکەیی و زیاتر هەستان پێی :

جا تا کردەوەکە جوانتر بێت ئەوا زیاد بوونی باوەڕ پێی گەورەتر دەبێت ، وە جوانی کردەوەش بەگوێرەی ١ـ نیەت پاکی ( الإخلاص ) ـ ٢ ـ وە بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە و وە پێغەمبەرەکەشی ﷺ ئەنجامی داوە ( المتابعة ).

وە جۆری کردەوە : بێگومان فەرز گەورەترە لە سوونەت ، وە هەندێ لە کارەکان هەیە مرۆڤی موسوڵمان بیکات لە هەندێکی تر گەورەتر و زیاتر دووپات لێکراوە ، چونکە هەتا کردەوەی بە فەرمانی پەروەردگار گەورەتر بێت ئەوا باوەڕیش زیاتر پێی زیاد دەکات .

بەڵام کردەوەی زۆر : بێگومان باوەڕ پێی زیاد دەکات ، چونکە کردەوە لە باوەڕە ، وە گومان نییە کە باوەڕ زیاد بکات بە زیاد بوونی کردەوە [٩٥] .

پاشان لە گەورەترین کردەوە چاکەکانی کە باوەڕ پێی زیاد دەکات جگە لەوانەی کە ڕابوورد : بانگەواز بۆلای دینی خوای گەورە وە پاشان دانیشتن لەگەڵ خەڵکانی باشدا وە لەبەر گرنگی ئەم دوو بەندە و گەورەیی سوودیان بۆ زیاد بوونی باوەڕ پێویستە لێرەتا قسەیان لەسەر بکرێت :

بانگەواز بۆلای خوای پەروەردگار و دینەکەی ، وە ئامۆژگاری بە حەق و بە ئارامگری و بانگەشە بۆ ئەصلی دین و وە بانگەشە بۆلای پەیوەست بوون بە یاساکانی فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ، و ئامۆژگاری موسوڵمانان ، ئائەمانە بێگومان لە پێویستییەکانی باوەڕ و هۆکارەکانێتی ، هەر بەمە بەندە خۆشی غەیری خۆشی کامل دەکات ، هەروەك پەروەردگار سوێند دەخوات بە عەسر ، کە ئادەمی لە زیان و خەسارەت مەندیدایە ، مەگەر کەسێك بەم چوار وەصفە وەصف

---

[٩٥] ( فتح رب البرية ) ( ص : ٦٥ ) .

کرابێت : ١ـ باوەڕ ٢ـ کردەوەی چاك ، کە بەم دووانە نـەفس کامـل دەبێـت ، ٣ـ ئامۆژگاری و وەسیەت بە حەق : ئەویش کە زانستێکی بەسوود و کردەوەی چاك دینی ڕاست و درووستە ، ٤ـ وە ئامۆژکاری بە ئارامگری لەسەر هەموو ئەمانـە ، کـە بـەم دووانە هەموو گۆشەکانی دین تەواو و کامل دەبێت .

چـونکە خـودی بانگـەواز بـۆلای دینـی پـەروەردگار و ئامۆژگـاری بەنـدەکانی ، لەگەورەترین کەرەستەکانی بەهێز بوونی باوەڕە ، چونکە خاوەن بانگەواز پێویستە کـە هەوڵ بدات بۆ سەرخستنی ئەم بانگەوازە ، وە بەڵگە و نیشانەش ڕاپـەڕێنێت بـۆ هاتنـە جێ ، وە هەموو کارەکان لـە جێگە و پێگەی خۆیەوە بێنێـت ، وە بگـات بـە کـار و ویستەکان لە ڕێگەی خۆیانەوە ، وە ئەم کارانەش لە ڕێگاکانی باوەڕ و دەرگاکانیـەوە دەبێت .

شیخ الإسلام ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : هۆی باوەڕ و ڕێگاکـانی : جـاری وا هەیـە لـە بەنـدە خۆیەوەیـە ، وە جـاری واش هەیـە لەغـەیری خۆیەوەیـە ، وەك ، کەسێکی بۆ بەئاگا بهێنرێت کە بانگی بکات بۆ بـاوەڕ هێنـان ، وە کەسـێك فـەرمانی چاکەی پێبکات و ڕێگری لێبکات لە خراپە ، وە نیشانە و بەڵگەکانی دینی بـۆ ڕوون کاتەوە و وە ئەوەشی کە تیایدایە و ئامۆژگاری پێوەر دەگرێت ، وە جگە لەمانەش لـە هۆکارەکانی تر [96]

وە هەروەها پاداشتیش لە وێنەی کردەوەیە چەندە هەوڵ بدات بۆ کامڵ کردنی خەڵك و ئامۆژگاریان بکات و بە حەق و ڕاستی ، وە ئارامگریش بێت لەسەری ئەوا بێگومان کە پەروەردگاریش پاداشتی دەداتەوە بە هاوشێوەی کردەوەکەی ، وە سەری دەخات و پشتگیریـشی لێـدەکات لەلایـەن خۆیـەوە و بـە هێـزی بـاوەڕ و پـشت بەسـتن بـە پەروەردگاری ، چـونکە بێگومـان بـاوەڕ و هێـزی پـشت بەسـتن بـە خـوای گـەورە سەرکەوتن بەسەر دووژمنان لە مرۆڤە شەیتانەکان و شەیتانەکانی جنۆکەش دێنێتە جـێ

---

[96] ( الفتاوى ) ( ٧ : ٦٥ ) .

هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ النحل: ٩٩

واتە : بێگومان شەیتان هیچ توانا و دەسەلاتێکی نییە بەسەر ئەوانەی کـە باوەڕیـان بـە خوای پەروەردگار هێناوە و وە بەس پشتیش بەو دەبەستن .

وە هەروەها ئەو کەسە بۆ سەرخستنی دینی خوا بەرێ کەوتووە ، وە هەرکەسێك بەرەو بەشێکی بەرێ بکەوێت ، ئەوا دەرگاکانی زانست و باوەڕی لێدەکرێتـەوە بەئەنـدازەی ڕاستگۆیی و نییەت پاکێکەی [٩٧] .

جا پێویستە بۆ ئەو کەسەی کە فەرمان دەکات بە چاکەو ڕێگری دەکات لـە خراپـە ، وە بانگخوازە بۆلای ڕێگەی ڕاستی پەروەردگار ، پابەند بێت بـە ڕاسـتگۆیی و نییـەت پاکییەوە لـە فەرمانەکانی و ڕێگرییەکانیـشیدا ، هـەتا بگـات بـە بەروبوومەکـەی و وە باوەڕی ڕاست و خاوێن چەکەر بکات و بڕوێت لـە خودی خۆیی و بانکراوەکانیشدا ، وە لـە بانگەوازەکەیدا پابەندی دانـایی و نـەرم و نیـانی بێـت و ئـارامگر بێـت لـەسـەر بانگکردنیان وە بەزانستیش بێت بەوەی کە بانگیان دەکات بۆلای [٩٨] .

جا ئەگەر ئەم صیفاتانەی تیادا هاتە جێ ئەوا بانگەشەکەی بـە بـەروبووم و بـە سـوود دەبێت ، بەویستی خوای پەروەردگار ، وە هۆکارێکیش دەبێت بۆ بەهێز بوونی باوەڕی خۆشی و ئەوانەیشی بانگی کردوون بۆهەق .

وە دانیشتن لـەگەڵ خەڵکی چاکدا و پابەند بـوون پێیانـەوە و هاوەڵییـان و بەتەنگـەوە بوونی لەسەر سوود لێبوون لێیانەوە ، ئەوە هۆیەکی گەورەیە بۆ زیاد بـوونی بـاوەڕ ، لەوەی کە هەیە لەو دانیشتنانەدا لە یادی پەروەردگار و ترسان لـە خـوای گـەورە و سزاکانی و هاندان بەلای چـاکە و ترسـاندن و دوورکەوتنـەوە لـە خراپـە و ، جگـە لـەمانەش چەندین کاری تر کـە لـە گـەورەترین هۆکارەکـانی زیـاد بـوونی بـاوەڕن ،

---

[٩٧] انظر ( التوضيح و البيان ) لابن سعدي ( ٣٦ ، ٣٧ ) .
[٩٨] انظر ( الفتاوى ) ( ٢٨ : ١٣٧ ) .

هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت :﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾ الذاريات: ٥٥

واتە : بەردەوام ئامۆژگاریان بکە چـونکە بێگومـان ئامۆژگـاری سـوود و کـەڵك بـە بڕواداران دەگەیەنێت .

وە هــەروەها دەفــەرموێت : ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ﴾ الأعلى: ٩ - ١١

واتە : ئامۆژگاریان بکە ئەگەر ئامۆژگاری سوودی بۆیان هەبێت﴿٩﴾ ئەو کەسەی کـە لـە خوای گەورە بترسێت ئەوا سوود و ئامۆژگـاری وەردەگرێـت﴿١٠﴾ وە کەسـی بـێ بڕواو بەد بەختیش خۆی لـە ئامۆژگاری لادەداو ناچێت بە گوێیدا ﴿١١﴾ .

وە ئەمە بەڵگەیە لـەسەر ئەوەی کە خاوەن دڵە بڕوادارەکان زۆر سوودمەند دەبـن لــە زیکر و دانیشتنی کۆڕی زیکر ، وە بەوەش گورج و گۆڵی و ویست و خواسـتیان بـۆ درووست دەبێت ، وە سوود و بەرز بوونەوەیان لای پەروەردگار بۆ پێویست دەبێت ، بە پێچەوانەی کۆڕودانیشتنی گاڵتە و بێ ئاگایی و چونکە ئـەو کـۆڕو دانیـشتنانە لــە گەورەترین هۆکارەکانی کەمی باوەڕ و تێکشکان و نەمانێتی .

هەر لـەبەر ئەمەیە پێشینەی چاکی ئێمە توندترین کەس بوون لـەسەر گوێدان بە کـۆڕی زیکر و یادی خوای پەروەردگار ، وە توندترین و دوورترین کـەس بـوون لــە کـۆڕی لـەهو گاڵتە و بێ ئاگایی ، وە لـە پێشەوە تێپەڕی بەسـەرماندا ووتـەی زۆر کـە بەڵگـە بێت لـەسەر ئەوە ، وەك وتەکەی عومەیری کوڕی حەبیبی خەطمي و موعـاذی کـوڕی جەبەل ﷺ وە جگە لـەوانیش .

وە کۆتا هۆ ئەم بەشەی پێ تەواو دەکەین ، پێویستە گوێی پێبدەین و لـێی بێ ئاگا نەبین ئەویش ئەوەیە : کە مرۆڤی موسوڵمان بەسەراچوونەوەیەکی نەفس و دەروونـی خـۆی بکات و وە دامەزراوی بکات لـەسەر بەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەو شتانەی کە بـاوەڕ

پێی کەم دەکات یاخود پێی لاواز دەبێت یان لەدەستی دەدات ، هەروەك چۆن پێوستە بۆ باوەڕ هەموو ئەو کارانە بکات کە باوەڕ پێی بەهێز دەبێت و نـشەونمای پێـدەکات ، لەگەڵ ئەوەشدا بەرەنگاربوونەوە و ڕووبەڕوو بوونـەوەی هـەموو ڕێگرەکـان وکـارە فریودەرەکان پێویستە ، ئەویش : خۆ دارنینە لە تاوان و تەوبەو گەڕانەوەیە لە وەی کە تێی کەوتووە ، و پاراستنی هەموو ئەندامەکانی جەستەیە لە شتە قەدەغە کراوەکان ، و بەرەنگار بوونەوەی هەموو فتنە گوماناویە لەکەدار کەرەکانە کە بنـەمای بـاوەڕ لاواز دەکات ، وە ئەو ئارەزووانەی کە لاواز کەرن بۆ ویستەکانی باوەڕ ، چونکە ویستەکان لە ئەصڵ و بنچینەدا حەز و خۆشەویستی و هەوڵ و کۆشـشیان هەیـە بـۆ چـاکە ، وە ئەوەش نایەتە جێ بە واز هێنان نەبێت لەو ویستانەی کە لەبەرامبەریدا هەیە لە حـەزی نەفس و دەروون بۆ خراپە ، وە بەرەنگاربوونەوەی نەفسی فەرمان کەر بەخراپە .
هەر کاتێك بەندە پارێزرا لـە کەوتنـە نـاو فیتنـە گوماناویـەکان و فیتنـە شـەهوەتی و ئارەزوویەکان ، ئەوا باوەڕی تەواو دەبێت و یەقین و دڵنیایشی بەهێز دەبێت .

**بەشی دووەم : ـ**

## هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ

ڕێخۆشکەر :

قسە لەوەی ڕابوورد دەربارەی هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ بوو ، بەڵام قسە لێرە و لەمەولا دەربارەی هۆکارەکانی کەم بوونەوەیەتی ، هەروەك چۆن باوەڕ چەندین هۆکار هەبوو بۆ زیاد بوون و گەشەی ، هەروەها چەندین هۆکاری لاوازی و کەم بوونەوەشی هەیە ، وە هەروەك چۆن موسوڵمان داوا لێکراوە بە ناسینی هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ بۆ ئەوەی جێبەجێی بکات ، هەروەها داوا لێکراوە بە ناسینی هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ بۆ ئەوەی خۆی لێ بپارێزێت لەو ڕوانگەیەوە :

عَرَفْتُ الشَّرَّ لا للشَّرِّ لَكِنْ لِتَوَقِّيهِ     وَ مَنْ لَمْ يَعْرِفِ الشَّرَّ مِنَ الخَيرِ يَقَعُ فِيهِ

شەڕم ناسی نەك بۆ شەڕ بەڵکو بۆ خۆپاراستن لێی

وە هەر کەسێك شەڕ و خێر لەیەك جیا نەکاتەوە ئەوا تێی دەکەوێت

وَ قَدْ ثَبَتَ فِي ( الصَّحِيحَينِ ) عَنْ حُذَيفَةَ بنِ اليَمَانِ ـ رضي الله عنهما ـ قَالَ : (( كَانَ الصَّحَابَةُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللهِ {صلى الله عليه وسلم} عَنِ الخَيرِ ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي )) [99] .

واتە : جێگیر بووە لە صەحیحی بوخاری موسلیمدا : لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە (ڕەزای خوایان لێبێت ) دەفەرموێت : هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی خێر ، منیش پرسیارم لێدەکرد دەربارەی شەڕ لەترسی ئەوەی کە پێم بگات (( تێی بکەوم )) .

وە ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ناسینی شەڕ بۆ ئاگادارییە لەوەی کە مرۆڤەکان تێی بکەون [100] .

---

[99] البخاري ( ٨ : ٩٣ ) ، و مسلم ( ٣ : ١٤٧٥ ) .
[100] ( تلبيس إبليس ) ( ص : ٤٠ ) ، و انظر ( الفتاوى ) لابن تيمية ( ١٠ : ٣٠١ ) و ما بعدها .

جا فێربوونی هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ و ناسینی کارەکانی کە لاوازی دەکەن و ڕێگاکانی خۆ پاراستن لێیان فەرمانێکی داواکراوە پێویستە گوێی پێبدرێت ، بەڵکو فێربوونی کەمتر نییە لە فێربوونی هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ .

وە پێش دەست پێکردن و ڕوونکردنەوە بە باسی هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ ، پێم خۆشە ئاماژە بکەم بەوەی کە نەبوونی پابەند بوون بە هۆکارەکانی باوەڕ و وەلا خستنی بەهێز بوونی و وازهێنان لەگوێ پێنەدان بەوە ، بە هۆیەك دەژمێرێت لە هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ ، ئیهمال کردن و وەلاخستنی ئەو باسانەی کە لە پێشەوە ئاماژەی پێدرا ، گوێ پێنەدانی باوەڕ کەم دەکاتەوە و لاوازی دەکات ، هەروەك چۆن گوێ پێدان و هەستان پێی هۆیە بۆ زیاد بوونی ، هەروەها وەلاخستنیشی هۆیە بۆ کەم بوونەوەی .

شیخ محمد صالح عثیمین ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بۆ کەم بوونەوەی باوەڕ چەند هۆکارێك هەیە .... ، چەندین شتی باس کردووە ، لەوانە : واز هێنان لە فەرمانی پەروەردگار ، بێگومان باوەڕ پێی کەم دەکات ، کەم کردنەکەشی بەگوێرەی دووپاتییە لەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگار ، چەندە گوێڕایەڵیەکە دوپاتر و دڵنیاتر بێت ئەوا کەم بوونەوەی باوەڕ بە وازهێنان لە گوێڕایەڵی خوای گەورە زیاتر دەبێت ، وە زۆر جار باوەڕ هیچی نامێنێت ، وەك وازهێنان لە نوێژ [101] .

بەڵگەش لەسەر ئەمەش ئەم وتەیەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت : ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس: ٩ - ١٠

واتە : بێگومان ڕزگاری بووە ئەو کەسەی کە نەفس و دەروونی خۆی لەهەموو کارێکی بەد و خراپ و فەساد پاککردۆتەوە ﴿٩﴾ وە بێگومان ئەو کەسەشی نەفسی خۆی بە تاوان و گوناه ئالوودە کردووە ئەوا نائومێد و بەد بەخت بووە ﴿١٠﴾ .

[101] ( فتح رب البرية ) ( ٦٦ ) .

ئەم دەقە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر گرنگی گوێڕایەڵی پەروەردگار و پاراستنی ، وە بێگومان لە گەورەترین هۆکارەکانی پاك و خاوێنی ناخ و دەروونە .
وە هەروەها لەبەرامبەردا بەڵگەیە لەسەر ترسناکی و خەتەری وازهێنان لە گوێڕایەڵی خوای گەورە و کەوتنە ناو تاوانەوە ، وە ئەمەش لەگەورەترین هۆیەکانی خەسارە مەندی و نائومێدییە .

ئیمام ابن جرير الطبري ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت : ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾ واتە : بێگومان براوە و سەرفراز بووە کەسێك نەفس و دەروونی خۆی خاوێن ڕاگرتبێت لە تاوان ، زۆر زۆر پاکی کردبێتەوە لە کوفر و تاوان وە چاکە خوازی تیادا بەرقەرار کردبێت بە کردەوە چاکەکان .
پاشان چەندین وتە لە سەلەفەوە باسکراوە کە پاڵ پشتی ئەمە دەکات :
گێڕڕاوەتەوە لە قەتادەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کە فەرموویەتی : هەر کەسێك کارێکە چاك بکات ئەوا نەفسی خۆی پاککردۆتەوە بە گوێڕایەڵی خوای گەورە .
وە هەروەها لێوەی گێڕڕاوەتەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کە فەرموویەتی : بێگومان دەربازی بووە ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاککردبێتەوە بە کردەوەی چاك .
وە باسکراوە لە لە ابن زەیدەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کە فەرموویەتی : سەرکەوتوو سەر فاز بووە ئەو کەسەی کە خوای گەورە ناخ و دەروونی پاککردبێتەوە.
وە باسکراوە لە موجاهید و سەعیدە کوڕی جوبەیر و عیکریمەوە ( ڕەحمەتی خوایان لێبێت ) کە فەرموویانە : دەربارەی ئەم ئایەتە : ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾ واتە : کەسێك چاکە خوازی تیادا بەرقەرار بکات [102] .
وە ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە شیخ حەسەنی بەصرییەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بێگومان سەرکەوتوو سەر فراز بووە کەسێك دەروونی

[102] ( تفسير الطبري ) ( ١٥ : ٢١١،٢١٢ ) .

پاككردبێتەوە و چاكە خوازی تیادا بەرقەرار دابێت و هەڵی نابێت لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە ، وە سەر گەردان و نائومێد بووە كەسێك كە دەروونی خۆی لەناو دابێت و هەڵی نابێت لەسەر تاوان بەرامبەر خوای پەروەردگار .

وە گواستراوەتەوە لە ابن قوتەیبەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) كە فەرموویەتی : مەبەست بەو كەسەی كە دەروونی خۆی خاوێن كاتەوە ، واتە : نشەونمای پێبكات و بەرز و بڵندی بكات بە گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خوای گەورە و خێر و چاكە و كردەوەی چاك [103] .

وە ئەم ئایەتە كە دەفەرموێت : ﴿ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ ئیمام ابن جریر الطبري (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەربارەی دەفەرموێت : خوای گەورە دەفەرموێت : بەد بەخت و بە ئاوات نەگەشتووە لە ڕێگای خاوێن كردنەوەی نەفس و ناخیدا كەسێك خوای گەورە نەفس و دەروونی چەپەڵ كردبێت و باری گوناهی لێنابێت و لە ڕێگای هیدایەت ترازاندبێتی هەتا پەرستشی خوای فەرامۆش كردبێت و ڕێگای تاوانی گرتبێتە بەر .

تێبینی وەرگێڕ : ئەم ڕافەیە هی شێخی طبری خۆیەتی بەڵام هەندێك لە خاوەن تەفسیرەكان دەفەرموون كەسێك خۆی دەروونی خۆی چەپەڵ و بێ نرخ كردبێت ئەم مەبەستەش شیاوتر دیارە خوا لەهەموو كەس زاناترە .

وە ابن جریر ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە موجاهیدەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت ﴿ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ واتە : نەفسی گومڕا كردووە .

وە لە سەعیدی كوڕی جوبەیریشەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : واتە : لە ڕێی هەق و ڕاست لای داوە .

وە لە قەتادەشەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : واتە : تاوان بار و خراپە كاری كردووە .

---

[103] ( إغاثة اللهفان ) ( ١ : ٦٥ ) .

وه ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ابن قوتەیبە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی : ﴿ دَسَّىٰهَا ﴾ واتە : نەفسی بێنرخ نادیار دەبێت بەبۆنەی وازهێنان لە کردەوەی چاك و سوار بوونی کەشتی تاوان ، وە کەسی خراپە کار هەمیشە ، جێی نهێنییە و بێ کەسایەتییە و مرۆڤێکی نادیار و سەر شۆڕە ، وە کەسی خراپە کار ، بێگومان فێڵ لە نەفسی خۆی دەکات و نەفس و ناخی خۆی زەلیل و سەر شۆڕ دەکات [١٠٤] .

جا هەر کەسێك ناخ و دەروونی خۆی خاوێن بکاتەوە بە کردنی ئەو کارانەی کەفەرمانی پێکراوە و دوور کەوتنەوە لەوانەی کە لێی قەدەغە کراوە ئەوە بێگومان سەرکەوت و سەر فرازە ، وە هەر کەسێك نەفسی خۆی ئالوودە بکات بە نەکردنی ئەو کارانەی کە فەرمانی پێکراوە وە هەستی بەوانەی کە لێی قەدەغە کراوە ئەو بەد بەخت خەسارەمەند بووە .

وە هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ و کارەکانی کە لاوازی دەکەن زۆر و جۆراو جۆرن ، جگە لەوە نەبێت بکۆی گشتی دەبن بە دوو بەشەوە : ١ـ هۆکارە ناوەکییەکان ، ٢ـ وە هۆکارە دەرەکییەکان ، وە لەژێر هەر بەشێکیاندا چەند کارێك هەیە بۆ لاواز کردنی باوەڕ .

[١٠٤] ( إغاثة اللهفان ) ( ١ : ٦٥ ) ، و انظر : ( التبيان في أقسام القرآن ) لابن القيم ( ص : ٢١ ) .

بەشی یەکەم : ـ

## هۆکارە ناوەکییەکان

ئەویش کارە خودیەکانە کە کاریگەری هەیە لەسەر کەمکردنی باوەڕ ، ئەوانیش چەند هۆکارێکن :

هۆکاری یەکەم : ـ

## نەفامی کە دژی زانستە

نەفامی لە گەورەترین هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕە ، هەروەك چۆن زانست لە گەورەترین هۆکارەکانی زیاد بوونیەتی ، موسوڵمانی زانا خۆشەویستی و کردەوەیەك کە زەرەر و ئازاری پێبگەیەنێت و ماندوی بکات نایدا بەسەر کردەوەیەکدا کە سوود و سەرفرازی و چاکە خوازی تیادا بێت ، بەڵام کەسی نەفام لەبەر زۆری نەفامی و کەمی زانستی ، هەندێ جار وێنەی ئەم کارانە دەدات بەسەر کارێکدا کە چاکە و سەرفرازی بۆی تیا بێت ، ئەویش بەبۆنەی هەڵگەڕانەوەی پێوانە لەلای ئەو و لاوازی هەست و هۆشی تیایدا ، بۆیە زانست بنەمایە بۆ هەموو خێرێك ، وە نەفامیش بنەمایە بۆ هەموو خراپەیەك .

وە خۆشەویستی ستەم و دەست درێژی و ئەنجامدانی تاوان و هەستان بەکارە قەدەغە کراوەکان هۆکاری یەکەمی : نەفامی و زانستی خراپە ، یاخود خراپی ویستە ، وە خراپی ویستیش لە خراپی زانستە .

جا نەفامی و زانستی خراپ هۆی سەرەکین بۆ خراپی کردەوەکان و کەمی باوەڕ .

ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : وتراوە کە خراپی ویست لە خراپی زانستەوەیە ، ئەگەر کەسێك بەڕاستی بزانێت لە شتێکی زەرەراویدا زەرەر هەیە ئەوا نایکات ، هەر لەبەر ئەمەیە کەسێك بزانێت لە خواردنێکی خۆشدا زەهر هەیە ئەوا

نايخوات و بەرەو ڕوويشى نارِوات ، جا كەمى زانستى بەو زەرەرەى كە هەيە لـە شـتە زەرەراويێكەدا و لاوازى سووربوونى لە وازهێنانى دەيخاتە ناو كردنيەوە ، لـەبەر ئەمەيـە باوەڕى ڕاستەقينە ئەوەيە كە خاوەنەكەى هەڵدەنيێت لـەسەر كردنى كارێك كە سوودى پێبگەنيێت و وازهێنان لـە كارێك كە زەرەرى پێبگەيەنيێت ، جا كاتێك وانەبێت و واز لـە كـارى خـراپ نـەهێنێت ، ئـەوا بـاوەڕى ڕاسـتەقينە نييـە ، بـەڵكو بـاوەڕى بـەپێى هەڵسووكەوتێى ، چونكە بێگومان كەسێك كـەوا بـاوەڕى بـەئاگرى دۆزەخ هـەبێت هەروەك وابێ ببينێت ئەوا ڕێگاكەى ناگرێتـە بـەر ، هـەر هەوڵيـشى بـۆ نـادات ، وە باوەڕدارى ڕاستەقينە بە بەهەشت نەفسى بارگرانى ناكات لـە داواكـردن و داخـوازى بەهەشت ، ئەمە كارێكە ئادەمى دەستى دەكەوێت لە ناخيدا لـەوەى كـە هـەوڵى بـۆ دەدات لـە دونيادا لـە سوودوو قازانجەكان ، ياخود هەوڵ دەدات لە دەرباز بـوون لـە زەرەرو زيان [105] .

جا نـەفس حـەز لـەوە دەكـات كـە زەرەرى بـۆى هەيـە نـەك لـەوەى كـە سـوودى پێدەگەيەنێت لـەبەر نەزانينى بە زەرەرەكەى ، لـەبەر ئەمەيە هەركەسێك بيربكاتـەوە لـە قورئانى پيرۆز ، دەستى دەكەوێت تيايدا گەورەترين ئاماژە كە نەفامى هۆكارى تاوان و گوناهە .

وە خواى گەورە دەفەرموێت : ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ۝١٣٨﴾ الأعراف: ١٣٨

واتە : نەوەى يسرائيل وتيان ئەى مووسا خوايەكمان بۆ پەيدا بكە هەروەك ئـەو قەومـە چەند خوايەكيان بۆخۆيان داناوە دەيپەرستن مووساش فەرمووى بێگومان ئێوە گـەلێكى نەفام و نەزانن .

---

[105] ( إغاثة اللهفان ) ( ٢ : ١٣٣ ) .

وه خـــوای گـــهوره دهفـــهرموێت :﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ النمل: ٥٤ ـ ٥٥

واته : باسی لوط بکه کاتێك که بهگهلهکـهی وت ، بـۆ ئـهوهی بێـدار و ئاگاداریـان بکاتهوه ، ئێوه کاری زۆر قێزهون و ناشرین دهکهن که نێربازییه کهس پێش ئێـوه ئـهم کارهی ئهنجام نهداوه ، وه خۆشتان دهبینن که ئهم کاره چ کارێکی ناشرین و ناپهسـهند و ناڕهوایه ﴿٥٤﴾ ئایه ڕهوایه ئێوه ئارهزووی خۆتان له لهگهڵ پیـاوان بـهکار دههێـنن و وازتان لـه ئافرهتان هێناوه ، بهڵکو ئێوه کۆمهڵه خهڵکێکی نهفامن .

وه دهفهرموێت : ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الزمر: ٦٤

واته : موشریك و بیٚ باوهڕهکان که پێغهمبهری خـوا ﷺ ناوبـهناو بتـهکانی ئـهوانیش بپهرستیٚ ، بۆیه ئهم ئایهته دابهزی ، ئهی پێغهمبهر ﷺ بڵێ : ئێوه فهرمانم پیٚ دهکهن که لهجیاتی خوا بپرستم ئهی نهفام و نهزانهکان .

وه دهفـــــهرموێت : ﴿ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٣

واته : ئهی ژنانی پێغهمبهر ﷺ لـه ماڵهکانتانـدا ئـۆقره بگـرن و بـیٚ کـاری پێویـست دهرمهچن وهك سهردهمی نهفامیش خۆتان دهرمهخهن و جوانی خۆتان بۆ پیاوان ئاشکرا مهکهن .

تێبینی وهرگێڕ : ئهم ئایهته تهنها تایبهت نییـه بـه خێزانـهکانی پێغهمبـهرهوه ﷺ بـهڵکو ههموو ئافرهتهکانی ئومهتی ئیسلام دهگرێتهوه که نابێت جوانی خۆیان دهربخهن بـهڵکو حهرامه .

وە چەندین دەقی تر کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خەڵك تێی کەوتووە لە هاوبەش بۆ خوا دانان و کوفرو خراپە و تاوان گەورەترین هۆکارەکانی ، نەفامی و بێ زانستییە بەرامبەر خوای گەورە و ناو و صیفاتە بەرزەکانی و پاداشت و تۆڵەی .

هەر لەبەر ئەمەیە کە هەر کەسێك دژایەتی خوای گەورە بکات یاخود تاوانێك ئەنجام بدات ئەوە نەفامە ، هەروەك لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا هاتووە لە سەلەفی صاڵحەوە کە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾ النساء: ١٧

واتە : بەڕاستی خوای گەورە تەوبە لەو کەسانە وەردەگرێت کە بە نەفامی و نەزانی کردەوەی خراپ دەکەن ، پاشان لەماوەیەکی کەمدا تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە ئائەوانە خوای گەورە تەوبەیان لێ وەردەگرێت وە خوای گەورە هەمیشە زانا و کار جوانە دەزانێت چۆن بڕیار دەدات .

وە دەفەرموێت : ﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأنعام: ٥٤

واتە : پەروەردگار لەسەر خۆی نوسیوە کە بەبەزەیی بێت لەگەڵتان ، وە هەر کەسێکیشتان بە نەزانی و نەفامی تاوانێك ئەنجام بدات ، پاشان تەوبە بکات و ئاکاری چاك ڕەچاو بکات ، ئەوا بەڕاستی خوای گەورەش لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا زۆر لێبوردە و داپۆشەری تاوانەکانە و زۆریش میهرەبانە .

وە دەفەرموێت : ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ ﴾ النحل: ١١٩

واتە : بێگومان خوای گەورە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە کردەوەی خراپیان ئەنجامداوە بە نەفامی ، وە پاشان دوای کردنی ئەو کارە ناجۆر و ناپەسەندانە تەوبەیان کرد و چاك

و چاكه خواز بوون ، ئـەوا دڵنیابـە كـە پـەروەردگارت پـاش ئـەوە زۆر لێبـووردە و میهرەبانە .

واتای ووتەی خوای گەورە : ﴿بِجَهَٰلَةٍ﴾ لـە ئایەتەكاندا : واتە : نەزانی و نەفامی لـە تاوان كەرەكەو وە نەفامی بە دوارۆژ و پێویست بوونی تووڕەیی خوای گەورە لـەسەری وە خوای گەورە لـە ڕوانگەی نەفامی و نەزانییەوە لێی دەڕوانێت و چاودێری دەكات ، وە نەفامی و نەزانییە لێوەی لـەبەر كـەمی بـاوەڕی یـاخود نـەبوونی ، كەواتـە هـەموو كەسێكی تاوان كار نەفامە بەم لێكدانەوەیە بێـت ، بـەڵام ئەگـەر زانـی حەرامـە ئـەوا زانست بەحەرامییەكەی مەرجە بۆ ئەوەی كە بـەتاوان ژمـاردە بكرێـت و تۆڵـەی لـێ بسەندرێتەوە [١٠٦] .

بە وێنەی ئەم واتایە كۆمەڵێك لـە سەلـەف فەرموویانە ، وە ئیمامی طەبەریش ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) كۆمەڵێكی لێ گێڕاونەتەوە لـە تەفسیرەكەیدا .

لـە ئەبو عالیەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێـت ) دەگێڕێتـەوە كـە فەرموویـەتی : هـاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە ڕەزای خوا لـەوانیش بێت فەرموویانـە : هەرچـی تاوانێـك كـە تووشی بەندە دەبێت ئەوە نەزانی و نەفامییە .

وە لـە قەتادەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : هاوەڵانی پێغەمبەری خـوا ﷺ ڕەزای خوایان لێبێت كۆكن لـەسەر ئەوەی هەر شتێك كە لاساری خوای گەورەی پـێ بكرێت ئەوە نەفامییە جا بە مەبەست بێت یاخود نا .

وە لـە موجاهیدەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێـت ) دەفـەرموێت : هـەر كەسـێك لاسـاری خوای گەورە بكات ئەوە نەفام و نەزانە ، هەتا خۆی لـە تاوان دادەڕنێت .

وە هەروەها فەرموویەتی : هەر كەسێك كە كردەوەیەك بكات لاساری خـوای گـەورە بێت ئەوە لـە نەفامیە لێوەی هەتا لێی دەگەڕێتەوە و وازی لێدێنێت .

---

[١٠٦] ( تفسير ابن سعدي ) ( ٢ : ٣٩ ) .

وە سودیش ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ئادەمی مادەم لاساری خوای گەورە بکات ئەوە نەفامە .

وە ابن زەیدیش ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : هەموو مرۆڤێك کردەوەیەك بکات کە لاساری خوای گەورە بێت ئەوە بەهەمیشەیی نەفامە هەتا وازی لێدەهێنێت[١٠٧] .

وە شیخ الإسلام ابن تیمیه ( ڕحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ( هۆکاری ئەمە : ئەوەیە کە بەڕاستی زانستی ڕاستی چەسپاو لە دڵدا ڕێگری دەکات کە شتێکی لەگەڵدا بێت پێچەوانەی بێت لە وتە یاخود لە کردەوە ، جا هەر کاتێك پێچەوانەکەی دەرکەوت ئەوا یان دڵ لێی بێ ئاگایە یاخود بێ هێزە لە بەرگری کردنی ئەوەی کە تووشی هاتووە ، ئائەم دۆخانە هەڵوەشێنەرەوەی ڕاستی زانستە ، بۆیە کردنی ئەو تاوەنە دەبێت بەنەفامی ... )[١٠٨] .

نەفامی بەرامبەر بەخوا دەردێکی خەتەرە ، وە نەخۆشییەکی لەناو بەرە ، ناهەمواری و پاشەڕۆژی خراپ و نالەبار بەسەر خاوەنەکەیدا دێنێت ، جا هەر کەسێك ئەم دەردە زاڵ بوو بەسەریدا و تیایدا جێگیر بوو ئەوا پرسیار مەکە لە لەناو چوونی ، وە ئەوە کەوت و تێك شکاوە لە تاریکی تاوان و لایداوە لە ڕێگەی ڕاست ، ملکەچی گومان و ئارەزووەکانە ، مەگەر ڕەحمەتی خوای گەورە پێی بگات بە پاراو کردنی دڵەکان و ڕۆشنکردنەوەی چاوەکان و کلیلەکانی چاکە : ئەویش زانستی بەسوودە بۆ کردەوەی چاکە ، کەوابوو هیچ چارەیەك نییە بۆ ئەم دەردە جگە لە زانست نەبێت ، وە ئەم دەردە لەکەس نابێتەوە مەگەر خوای گەورە فێری ئەوەی بکات کە سوودی پێبگەیەنێت و ڕێنمووی بکات ، جا هەر کەسێك خوای گەورە ویستی خێری پێی بێت فێری ئەوەی دەکات کە سوود مەندی بکات و لە دین شارەزای دەکات و چاو ڕۆشنی دەکات لەوەی کە سەرفرازی و نەجاتی تیادایە و لە نەفامی پێی دەردەچێت ،

---

[١٠٧] انظر هذه الآثار و غيرها في : ( تفسير الطبري ) ( ٣ : ٢٩٩ ، ٥ : ٢٠٩ ) ، و انظر ( تفسير البغوي ) ( ١ : ٤٠٧ ) ، و الفتاوى لابن تيمية ( ٧ : ٢٢ ) ، و تفسير ( ابن كثير ) ( ١ : ٤٦٣ ) .

[١٠٨] ( إقتضاء الصراط المستقيم ) ( ص : ٧٨ ) .

وه ئەگەر ویستی خێری پێی نەبێت ئەوا لەسەر نەفامی خۆی دەیهێڵێتەوە . داواکـارین لە خوای گەورە دڵەکانمان پاراو بکات بە باوەڕ و زانست وە بمان پارێزێت لە نەفامەی و دوژمنایەتی .

هۆکاری دووەم : ـ

## بیٚ ئاگایی و پشت هەڵکردن و بیرچوونەوە

بێگومان ئەم سیٚ خاڵە هۆیەکی گەورەن لە هۆکارەکانی کەم بوونـەوەی بـاوەڕ ، جـا هەر کەسێك غەفڵەت گرتیٚوە و بیرچوونەوە خەریکی کردوو پشتیشی هەڵکرد ، ئەوا باوەڕی کەم دەکات و لاواز دەبێت بەگوێرەی زۆر بوونی ئەم کارانە یان هەندێکیان ، وە مردن و نەخۆشی دڵ و بۆ پێویست دەکات بـە زاڵبـوونی گومـان و ئارەزووەکـان بەسەریدا .

غەفڵەت و بیٚ ئاگایی : بەڕاستی خوای گەورە بەخراپە باسی کردوە لە قورئانـدا ، وە هەواڵی داوە کە ئەوە ڕەوشتێکی ناشرینە لە ڕەوشت و بیٚ باوەڕ و دوو ڕووەکانە ، وە ئاگاداری توونديشی دەربارەی داوە .

هـەروەك دەفـەرموێت : ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾ الأعراف: ١٧٩

واتە : سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆرێکمان لـە جنۆکـە و ئـادەمی بـۆ دۆزەخ بـەدی هێناوە چونکە لە ئەنجامدا خۆیان بە ئارەزووی خۆیان ڕێگەی بەدبـەختی دەگرنـە بـەر بۆیە بەر لەوەی خوای گەورە درووستیان بکات دەیزانی کیٚ چـاکەو کـێش خراپـە ، ئەوانە دڵیان هەیە کەچی حەق و ڕاستی پیٚ نابیستن و وەری ناگرن وە چاویشیان هەیە کەچی حەق و دەسەلآتی خوای گەورەی پیٚ نابینن وە هەستی بیـستنیان هەیـە کەچـی ڕاستییەکانی پێنابیستن ، ئائەمانە وەك ئاژەڵ وان بەڵکو وێڵترن (( کەمترن )) وە ئەوانـە بیٚ ئاگان لـە ئایەت و نیشانەکانی پەروەردگار .

وه دەفـــــــەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾﴾ يونس: ٧ ـ ٨

واته : بێگومان ئەوانەی کە باوەڕ و ئومێدیان بە گەیشتنەوە بە ئێمە نییە لە ڕۆژی دوایدا وە بە ژیانی دونیا ڕازی بوون لەبری دوا ڕۆژ و پێی ئارام و دڵ خۆش بوون وە ئەوانەشی کە لە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە بێ ئاگان ﴿٧﴾ جێ و ڕێگەی ئەوانە ئاگرە بەهۆی ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامیان داوە ﴿٨﴾ .

وه دەفەرموێت : ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾﴾ يونس: ٩٢

واته : بێگومان زۆرێك لە خەڵكی لە نیشانەکانی ئێمە بێ ئاگان ، بۆیە بەو شێوەیە ملی خۆیان دەشکێنن و خۆیان سەرگەردان دەکەن .

وه دەفـــــــەرموێت : ﴿يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾﴾ الروم: ٧

واته : هەندێك لە ڕواڵەت لە ژیانی دونیا دەزانن و بەدی دەکەن بەڵام لە دوارۆژ بێ ئاگان .

وه دەفـــــــەرموێت : ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾ الأعراف: ٢٠٥

واته : یادی پەروەردگارت بکە بە ترس و لاڕە ملی و لەسەرخۆ بەبێ دەنگ بەرز کردنەوە لە بەیانیان و دەمەو ئێواراندا وە لە بێ ئاگایان مەبە .

بێ ئاگایی بریتییە : لە بێ ئاگاییەك پەیدا دەبێت لە کەمی پارێزگاری و بەئاگایی [١٠٩] .

---

[١٠٩] ( بصائر ذوي التمييز ) للفيروزآبادي ( ٤ : ١٤٠ ) .

دەردێکی مەترسیدارە ، کاتێك تووشی مرۆڤەکان بێت خەریکیان ناکات بە زیکر و فەرمان ڕوایی و بەندایەتی خوای گەورەوە بەڵکو خەریکیان دەکات بەکاری بێ ئاگایی و خەریکەر و دوور خەرەوە لە یادی خوای گەورە ، ئەگەر کردەوەی باشیش بکات ئەوە لە دۆخ و نییەتێکی خراپەوەیە ، وەکردەوەیەکی ڕووت دەبێت لە زەلیلی و ملکەچی و گەڕانەوە و ترس و ئارامی و ڕاستگۆیی و نییەت پاکی ، ئائەمە هەندێك شوێنەواری بێ ئاگایی خراپە لەسەر باوەڕ .

وە پشت هەڵکردنیش : بەڕاستی خوای گەورە هەواڵی داوە لە قورئانی پیرۆزدا کە شوێنەوار و دەرئەنجامی خراپی زۆری هەیە لەوانە :

١ـ خوای گەورە وەصفی ئەو جۆرە کەسانەی کردووە بەوەی کە هیچ کەسێك نییە لەوانە ستەم کارتر بێت ، وە وەصفی کردووە کە لە تاوان کاران و ستەم کارانە .

هەروەك دەفەرموێت : ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ السجدة: ٢٢

واتە : کێ لەو کەسە ستەمکار ترە کە بە ئایەتەکانی پەروەردگار ئامۆژگاری دەکرێت کەچی پشتی تێدەکات و ڕووی لێ وەردەچەرخێنێت ، بەڕاستی ئێمە لە تاوان کاران و ستەم کاران تۆڵە دەسێنین .

٢ـ خوای گەورە هەوڵی داوە کە هەرکەسێك پشت هەڵبکات ئەوا دڵی ببەستێت و پەردەی تاریکی بەسەردا بدات تا هەرگیز نە تێبگات و نە ڕێگەی ڕاستیش بدۆزێتەوە .

وەك دەفەرموێت : ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾﴾ الكهف: ٥٧

واتە : ئەبێ کێ لەو کەسە ستەم کارتر بێت کە بە ئایەتەکانی پەروەردگار ئامۆژگاری بکرێت کەچی پشتیان تێ بکات وە سەرەنجام و ئاکامی ئەو کارە خراپانەشی کە

کردوویەتی لەبیری کردبێ ، بەڕاستی بەهۆی لاساری و ستەم کاری خۆیانەوە ئێمـەش پەردەمان بەسەر دڵیاندا دا هەتا لە واتا و مەبەستی باوەڕ تێنەگەن وە گوێشیانمان هێندە قورس و گران کرد هەتا حەق و ڕاستی نەبیستن چونکە خۆیان نایانەوێت بیبیستن ، خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێگەی ڕاست هەرگیز ڕێنموونی وەرناگرن و وەڵام نادەنەوە چونکە ئەوان تێناگەن .

٣ـ پشت هەڵکردن و ڕوو وەرچەرخان هۆیەکە بۆ ژیانی پڕ لە نارەحەتی و هـەمواری لە دونیاو دوا ڕۆژدا هەروەك خوای گەورە دەفـەرموێت :﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: ١٢٤

واتە : هەر کەسێك ڕوو لە زیکر و یادی من وەرگێڕێت کە قورئان و دینـی ئیـسلامە ئەوا بێگومان ژیانێکی سەخت و ناهەمواری دەبێت و وە لەڕۆژی دوایشدا بـە کـوێری حەشر و دادگایی دەکەین .

٤ـ خوای گەورە هەواڵی داوە کە هەرکەسێك پشت هەڵبکات و ڕوو وەرچەرخێنێت ئەوا کۆمەڵە هاوەڵێکی بۆ دەسازێنرێت لە شەیتان کە دین و باوەڕی لەناو بـەرن وەك دەفـــــــەرموێت :﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ الزخرف: ٣٦

واتە : هەر کەسێك لە یادو زیکری خوای ڕوو وەرگێڕێت ئـەوا ئێمـە شـەیتانێکی بـۆ دەسازێنین کە هەرگیز لێی نەبێتەوە و هاوڕێی بێت .

٥ـ هەواڵی خوای گەورە دەربارەی پشت هەڵکەر کە لەڕۆژی دوایـدا کـۆڵی تـاوان هەڵـدەگرێت و بـەرەو ئەشـکەنجەی نارەحـەت و قـورس و گـران دەڕوات وەك دەفـەرموێت :﴿ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ طه: ٩٩ ـ ١٠٠

واته : بێگومان لەلایەن خۆمانەوە یاد خەرەوەیەکمان پێ بەخشیویت ( واتە : قورئان ) ﴿٩٩﴾ جا هەرکەسێك پشتی تێ بکات و گوێی پێ نەدات ئەوا لەڕۆژی دوایدا کۆڵی تاوان و گوناه هەڵدەگرێت .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ ﴾ الجن: ١٧[110]

واته : هەر کەسێك لە یادی پەروەردگاری خۆی ڕوو وەرچەرخێنێت ئەوا خوای گەورە دەیخاتە ناو سزایەکی سەختەوە .

وە چەندین ئایەتی تریش کە خوای گەورە هەواڵی داوە تیایاندا دەربارەی زەرەر و ترسناکی پشت هەڵکردن ، لە ترسناکترینیان و خراپترینیان ئەوەیە کە ڕێگر و بەربەستە لە باوەڕ هێنان بۆ کەسێك کە باوەڕی نەبێت ، وە لاواز کەرە بۆ باوەڕی باوەڕداریش ، وە بەگوێرەی پشت هەڵکردنی مرۆڤەکان بەشیان لەم دەرئەنجام و ترسناکییە دەبێت .

وە بیرچوونەوە و لەبیرکردن : وازهێنانی مرۆڤە لە کارامەیی و پاراستنی ئەوەی کە لای سپاردە کراوە : جا یان لەبەر لاوازی دڵیەتی یاخود لەبەر بێ ئاگاییەتی ، وە یاخود لەبەر ویستێکە هەتا لە دڵدا باس و خواستی نامێنێت [111] ، جا لەبیر کردن کاریگەرییەکی ئەتۆی هەیە لە باوەڕدا ، وە هۆیەکە لە هۆکارەکانی لاواز بوونی ، وە بوونی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە کەم دەکاتەوە و تاوانیش زیاد دەکات .

جا ئەو لەبیرکردنەی کە لە قورئاندا هاتووە دوو جۆرە :

١ـ جۆری یەکەم ئەوەیە کە مرۆڤەکان تیایدا بیانوو بەهانە و پۆزشیان نییە ، ئەوەیە کە مرۆڤەکان بە ویست و مەبەستی خۆیان کردوویانە وەك ئەم ئایەتەی قورئان کە دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر: ١٩

---

[110] واتای ( صعدا ) نووسەر خوا بی پارێزێت دەفەرموێت ، واتە : توند و نارِحەت .

[111] ( بصائر ذوي التميز ) للفيروزآبادي ( ٥ : ٤٩ ) .

واته : ئێوه وەك ئـەو كەسـانە مـەبن كـە خـوای گـەورەیان لـەیاد كـرد گوێـیـان بـە فەرمانەكانی نەدا ، ئینجا خوای گەورەش وای بەسەر هێنان خۆشیان لـەبیركرد نـەیان زانی كارێكی وەها بكەن كە لـە دوارِۆژدا سوود مەندیان بكات .

٢ــ جـۆری دووەم مرۆڤـەكان تیایـدا بەهانـە و پۆزشـیان هەیـە ئـەویش ئەوەیـە كـە هۆكارەكەی خۆی نییە هەروەك لـەم ئایەتـەدا بۆمـان دەردەكـەوێت كـە پـەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ البقرة: ٢٨٦

واته : پەروەردگارا ئێمە ئەگەر فەرمانێكی تۆمان لـەبیرچوو یاخود هەڵـەمان تیـادا كـرد ئەوا لیّ مان مەگرە .

وە لـە فەرموودەیەكدا هاتووە كە خوای گەورە لـە وەڵامی ئـەم داوایـەدا فەرموویـەتی (منیش كردم [١١٢] ) واته : پارِانەوەكەتانم قبوڵ كرد .

جا مرۆڤی موسوڵمان دوا لێكراوە كە بەرامبەر ئارەزوو و نەفسی كۆشـشی هـەبێت و دووری خاتەوە لـە لـەبیركردن هەتا بەو هۆیەوە زەرەر لـە دین و ئیمانی نەكەوێت .

[١١٢] رواه مسلم ( ١: ١١٦ ) من حديث ابن عباس رضي الله عنهما .

هۆکاری سێیەم : -

## لاساری کردن و ئەنجامدانی تاوان

هیچ شاراوە و نادیار نییە کە لە لاساری کردن و ئەنجامدانی تاواندا چ زەرەر و شوێنەوارێکی خراپی هەیە لەسەر باوەڕ ، باوەڕ هەروەك زانایانی پێشینە فەرموویانە : بە گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە زیاد دەکات و بە تاوان کردنیش کەم دەکات ، جا هەروەك چۆن ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە لە واجب و سوونەت باوەڕ پێی زیاد دەکات ئاواش ئەنجامدانی ئەوانەی کە قەدەغەی کردووە لە کارە حەرام و ناپەسەندەکان باوەڕ پێی کەم دەکات ، جگە لەوەش تاوانەکان جیاوازییەکی گەورەیان هەیە لە پلە و خراپەیان و ئەندازەی زەرەریان .

هەروەك پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بێ گومان کوفر و خراپە و تاوانەکان پلەپلەن ، هەروەك چۆن باوەڕ و کرەوەی چاك پلەپلەن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٣

واتە : بۆ هەر یەکێك لە خەڵکانی چاك و لە خەڵکانی خراپ لای خوای پەروەردگار پلە و پایە هەیە وە خوای گەورە بە هەموو کردەوەکان بینایە و هیچ شتێکی لێ ون نابێت .

وە دەفەرموێت : ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ الأنعام: ١٣٢

واتە : بۆ هەر مرۆڤێك چاك بێت یاخود خراپ پلە و پایە و پاداشت و تۆڵە هەیە لە بەرامبەر ئەو کارانەی کە کردوویانە ، وە خوای پەروەردگاریشت بەرامبەر ئەو کردەوانەی کە دەیکەن بێ ئاگا نییە واتە کردەوەی کەس ون نابێت .

وه دهفهرمویّت : ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ﴿٣٧﴾﴾ التوبة: ٣٧

واته : بێگومان ڕاگواستن و دواخستنی مانگێك بۆ مانگێکی تر و دواخستنی حورمەتی مانگێك بۆ یەکێکی تر ئەوە زیادەیە لە کوفر و بێ باوەڕی .

وه دهفهرمویّت : ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾ التوبة: ١٢٤ ـ ١٢٥

واته : ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە دابەزینی سورەتێکی قورئان باوەڕیان زیاد دەکات و بە هاتنەکەی دڵشاد و کامەران دەبن ﴿١٢٤﴾ وە ئەوانەشی کە لە دڵیاندا نەخۆشی و دووڕوویی هەیە ئەوا کوفر و ناپاکییان زیاد دەکات و خەستتر دەبێتەوە وە هەر بە بێ باوەڕیش مردن و دوور بوون لە دینی ئیسلام ﴿١٢٥﴾ .

وێنەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرە [113] .

وە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە تاوانەکان گەورە و بچووکیان هەیە .

خوای گەورە دەفەرمویّت : ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾﴾ النساء: ٣١

واته : ئەگەر ئێوە لەو تاوانە گەورانە خۆتان بەدوور بگرن کەوالێتان قەدەغە کراوە ئەوا ئێمەش لە هەڵە و تاوانەکانتان دەبوورین و دەتان خەینە جێگایەکی بەڕێز و شکۆمەندەوە کە بەهەشتە .

وه دهفهرمویّت : ﴿ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ﴿٣٢﴾﴾ النجم: ٣٢

واته : ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن لە تاوانە گەورەکان و کارە قێزەونەکان ، جگە لە ووردە تاوان نەبێت وە پەروەردگار إن شاء الله لەوانە دەبورێت .

[113] ( إغاثة اللهفان ) ( ٢ : ١٤٢ ) .

وَفِي ( صحيح مسلم ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه : قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ -صلى الله عليه وسلم- « الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ إذا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ » [114] .

واته : لە صەحيحی موسليمدا هاتووە لە فەرموودەی ئەبو هورەيرەوە ( ڕەزای خوای لێبێت ) کە فەرموويەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : هەر پێنج نوێژەکەو ئەم هەينی تا ئەو هەينی و ئەم ڕەمەزان تا ڕەمەزانەکەی تر کەفارەتی ئەو تاوانانەن کە لە نێوانياندايە ئەگەر خۆی لە تاوانە گەورەکان پاراستبێت .

وَفِي ( الصحيحين ) عن عبد الرحمن بن أبي بكرة عن أبيه قال : كُنَّا عِنْدَ رسولِ اللهِ - صلى الله عليه و سلم - قَالَ : ألا أُنَبِّئُكُمْ بأكْبَرِ الكَبائرِ ؟ ثلاثاً : الإِشْرَاكُ باللهِ ، وَعُقُوقُ الوالِدَيْنِ ، وَشَهادَةُ الزُّورِ )) [115] .

واته : لە صەحيحی بوخاری و موسليمدا هاتووە لە فەرموودەی عبد الرحمن بن أبی بكره ئەويش لە باوکێوە ( ڕەزای خوايان لێبێت ) کە فەرموويەتی : ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووين ﷺ سێ جار فەرمووی : ئايە هەواڵتان بەمێ بە گەورەترينی تاوانە گەورەکان ؟ هاوەڵ بۆ خوا دانان و خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ دايك و باوك و شايەتی دانی درۆ .

وَ فيهما عَنْهُ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ : أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللهِ؟ قَالَ : « أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ » . قِيلَ : ثُمَّ أَيُّ ؟ قَالَ : « أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ » . قِيلَ : ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ : « أَنْ تَزْنِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ » [116] .

واته : وە هەر لە صەحيحی بوخاری و موسليمدا هاتووە هەرلەوەوە کە پرسيار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەورەترين تاوان لای خوای گەورە کامەيە ؟ فەرمووی : هاوەڵ بۆ خوای گەورە دانێيت کە ئەويش درووستی کردوويت ، پاشان وترا چی تر ؟ فەرمووی : منداڵەکەت بکوژيت لە ترسی ئەوەی کە لە گەڵتا بخوات ( واتە : لە

[114] ( صحيح مسلم ) ( ١ : ٢٠٩ ) .
[115] البخاري ( ١٠ : ٤٠٥ ـ فتح ) ، و مسلم ( ١ : ٩١ ) .
[116] البخاري ( ١٢ : ١٨٧ ـ فتح ) ، و مسلم ( ١ : ٩١ ) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه .

ترسی هەژاری – وەرگێڕ ) ، پاشان وترا چی تـر ، فـەرمووی : زینـا و داوێـن پیـسی لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەتدا بکەیت .
وە چەندین دەقی تر کە بەڵگەن لەسـەر جیـاوازی تاوانـەکان و بەشـکردنیان بـۆ لای گەورە و بچووك .
پاشان تاوانەکان لە لایەکی ترەوە دەبن بەچوار بەشەوە :
١ـ مُلکیة ٢ـ شیطانیة ٣ـ سَبُعیة ٤ـ بَهیمیة . لەمانە دەرناچن .
١ـ تاوانی خاوەن دارێتی : ئەویش ئەوەیە کە دەست بـەرێت بـۆ شـتێك کـە بـۆ ئـەو نەگونجێت لە صیفاتی ربوبیەت : وەکو خۆبەگـەورە دانـان ، وە خـۆی بـەوە بزانێـت شیاوی تۆڵە سەند بێت وەکو ئەوەی خوای گـەورە تۆڵـە دەسـێنێت ، وەخـۆ بەبـەرز ڕاگرتن وەك ئەوەی خوای گەورە سیفەتی بەرزییەتی هەیە ، وە خەڵکی کردنە بەندەی خۆی هەروەکو هەموو دروستکراوەکان بەندی خوان ، وەوێنەی ئـەوە ، ئائـەو جـۆرە گەورەترین جۆرەکانی تاوانە .
٢ـ شەیتانی واتە : خۆی هاوشێوەی شەیتان بکات لە حەسـوودی و فێـڵ و تەڵەکـە و دزی و فەرمانکردن بە لاساری و تاوان بەرامبەر خوای گەورە و جوانکردنی و ڕێگری کردن لە گوێڕایەڵی خوای گەورە و عەیبدار کردنی و دانانی بیدعە لـە دینەکەیـدا و بانگەشە کردن بۆ بیدعە و خۆرافات و گومڕایی .
ئەم جۆرە بەدوای جۆری یەکەمـدا دێـت لـە خراپیـدا هەرچـەندە خراپەکەشـی لـەو کەمترە.
٣ـ تاوانە دڕندەییەکان : بریتییە لە تاوانی شەڕان گێزی و تووڕە بوون و خوێن ڕشتن و دەست گرتن بەسەر لاوازان و بێ توانایان ، وە ئەم تاوانانـە چـەندین جـۆر عـەزێت و نارەحەتی مرۆڤایەتی لێوە درووست دەبێت لەگەڵ هەوڵ دان بۆ ستەم کردن .
٤ـ تاوانە ئاژەڵییەکان : وەك شەڕ و بەتەنگەوە چوونی بۆ بەجێهێنانی ئارەزووی سك و دامێنی ، لەمانەشەوە زینا و داوێن پیسی و دزی و خواردنی ماڵی بێ باوك و بەغیلی و ترسنۆکی و نائارامی و ناهەمواری چەندین ئاکاری خراپ درووست دەبێت .

زۆربەی تاوانەکانی مرۆڤەکان لەم بەشەیە ، لەبەر بێ توانایـیـان بـۆ تاوانـە دڕنـدەیی و خاوەن دارێکـە ، وە هـەر لـەم بەشـەوە دەچـنە نـاو بەشـەکانی تـرەوە ، ئـەم بەشـە بەرەشۆکەی دەیانگرێت ڕایان دەکێشێت ، جا لـەوێوە دەچـنە نـاو تاوانـە شـەیتانی و دڕندەیەکانەوە ، پاشان لەوێوە بۆ بەربەرەکانی خوایەتی خوای پەروەردگار و هاوەڵ بۆ دانانی [117] .

بەهەر حاڵ ئەمانە و جگە لەمانەش ڕێنمایی مان دەکەن کە تاوانەکان جیاوازن لەڕووی کاریگەرییانەوە لەسەر باوەڕ چ لەڕووی کەم کردنیەوە وە چ لەڕووی لاواز بوونیەوە. ئەم جیاوازیانەی تاوانەکان و کاریگەریـەکانیان لەسـەر بـاوەڕ دەگەڕێتـەوە بـۆ چـەند لێکدانەوەیەك :

لەوانە : جۆر و ئەندازە و زۆری خراپـی و شـوێن و کـاتی و حـاڵی تـاوان کارەکـە چەندین لێکدانەوەی تر .

پێشەوا ابن القیم دەفەرموێت : بەکۆی گشتی پلەکانی خراپە کاری جیاوازە بەگوێرەی خراپەیان ، جا ئەو پیـاوەی ئافرەتێـك دەکـات بـە دۆسـت و هـاوڕێی خـۆی وە ئـەو ئافرەتەشی کە دۆستێك لە پیـاوان دەگرێـت ، خراپـەو شـەڕی کـەمترە لـەو پیـاو و ئافرەتانەی کە داوێن پیسی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکـەن ، وە ئـەو کەسـەی کـە بەنهێنی تاوان ئەنجام دەدات تاوانی کەمتر لەسەرە تا ئەو کەسەی کـە بەئاشـکرا تـاوان دەکات ، وە هەروەها ئەو کەسەشی کە تاوان دەکات و باسـی ناکـات لـەوە تـاوانی کەمترە کە بۆ خەڵکی باس دەکات ، ئەوە دوورە لە لێبووردن و لێ خۆشبوونی خوای گەورە ، وە هەروەها زینا کردن لەگەڵ ئافرەتێکدا کە مێردی نەبێت سزاکەی کـەمترە لەچاو زینا کردن لەگەڵ ئافرەتێکدا کە مێردی هەبێت ، چـونکە زینـا کـردن لەگـەڵ ئافرەتێکدا کە مێردی هەبێت ستەم کردن و دەست درێژی کردنە لە پیاوەکەی و پیس کردنی جێگایەتی ، تاوانی ئەوە گـەورەترە لـە تـاوانی زینـای ئاسـایی یـاخود تاونێك

[117] انظر ( الجواب الكافي ) لابن القيم ( ص : ١٤٧ ) ، و( الفتاوى ) ( ١٣ : ٨٣ ) .

بچووكتر لە زینا ، وە زینا كردن لەگەڵ ژنی دراوسێدا تاوانەكەی گەورەترە لە چاو كردنی ئەو كارە لەگەڵ كەسێكدا كە دوور تر بێت ، لەوەی كە تیایدایە لە نارەحەت كردنی دراوسێ و نەپاراستنی ئامۆژگاری خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی ﷺ ، وە هەروەها زینا كردن لەگەڵ ژنی موجاهیدێكدا كە جیهاد دەكات لەپێناوی خوای گەورەدا تاوانەكەی گەورەترە لەلای خوا لە زینا كردن لەگەڵ كەسێكی تردا ، هەروەك چۆن پلەكانی ئەم تاوانە بەگوێرەی زینا لەگەڵ كراوەكە جیاوازە ، هەروەها پلەكانیشی جیاوازە بە گوێرەی كات و شوێن و بار و دۆخ و بكەرەكەی .

زینا كردن لە ڕەمەزاندا چ شەو بێت یاخود ڕۆژ پلەی تاوانەكەی گەورەترە لەچاو مانگەكانی تردا ، وە هەروەها لە شوێن و زەوییە پیرۆزە بەرێزەكاندا تاوانەكەی گەورەترە لەچاو شوێنی تردا .

وە جیاوازێكەی بەگوێرەی ئەو كەسەی كە دەیكات زینا كردن لەگەڵ ئافرەتێكی ئازاددا پیستر و ناشرین ترە هەتا لەگەڵ كەنیزەكێكدا ، هەر لەبەر ئەمەیە كە سزای داوێن پیسی ئافرەتێكی كەنیزەك نیوەی سزای ئازادێكە ، وە لەگەڵ ژنێكی مێرد داردا ناشرین ترە هەتا لەگەڵ بێ پیاوێكدا ، وە لەگەڵ پیرێكدا ناشرین ترە هەتا لەگەڵ گەنجێكدا ، وە لەگەڵ كەسێكی زانادا ناشرین تر و پیس ترە هەتا لەگەڵ كەسێكە نەفام و نەزاندا ، لەبەر زانستەكەی بە پیسیەكەی و لەوەشی كە لەسەرێتی و چوونی بۆ ئەو كارەش بە زانست و چاو ڕۆشنیەوە ، وە لەكەسێكی بەتوانای دەوڵەمەندەوە پیس ترو خراپ ترە هەتا هەژارێكی بێ توانا ، .... وە ئەوی كە پێویستە بزانرێت جاری وا هەیە تاوانێكی بچووك هاوكات دەبێت لەگەڵ شتێكدا كە ئەو تاوانە گەورە تردەكات لە تاوانێكی گەورە تر لەخۆشی بۆ نموونە :

هەندێ جار كاری داوێن پیسی هاوڕێ دەبێت لەگەڵ عیشق و ئەویندا بەجۆرێك دڵی تاوان كار ئالوودەی دڵدارەكەی دەكات وەك خوا تەماشای دەكات و ملكەچی دەبێت و فەرمانەكانی ئەو لە پێشتر دادەنێت تا فەرمانەكانی خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی ﷺ ئا لەم كاتەدا تاوانەكەی شان بە شان دەبێت لەگەڵ خۆشەویستی

خۆشەویستەکەیدا تەنانەت خۆشەویستی ئەوانەشی کە خۆشەویستەکەی خۆشی دەوێن یان خۆشی ناوێن یاخود ڕقی لێیەتی زیانی ئەمەش زۆر گەورەتر لە خودی تاوانەکە[118].

وە شیخ محمد صالح عثیمین ( ڕەحمەتی خوای لێبێت)دەفەرموێت : کەم بوونەوەی باوەڕ چەندین هۆکاری هەیە ... :

لەوانە تاوان کردن باوەڕ کەم دەکاتەوە بەگوێرەی جۆر و ئەندازە و بەکەم زانینەکەی و ئەندازەی حەز و ویست بۆی .

جا جۆر و ئەندازەکەی : بێگومان باوەڕ بە تاوانە گەورەکان زیاتر کەم دەکات هەتا بچووکەکان ، وە بەکوشتنی کەسێك بە ناهەق زیاتر کەم دەکات هەتا خواردنی ماڵێکی قەدەغە کراو ، وە بە دوو تاوان زیاتر کەم دەکات هەتا ئەنجامدانی تاوانێك . وە هەروەها بۆ هەموو تاوانەکانی تریش .

وە سستی و بەکەم زانینەکەی : کاتێك تاوان لە دڵێکەوە دەرچوو کە ئەو کەسەی بەکەم زانی کە تاوانی بەرامبەر دەکات و لێی نەدەترسا ئەوا باوەڕی زیاتر کەم دەکات هەتا کەسێك کە خوای گەرەی لا گەورەیە و زۆریش لێی دەترسێت ، بەڵام تاوان خەم ساردی کردووە .

وە ئەندازەی حەز و ویست بۆی : بێگومان تاوان کاتێك لە کەسێکەوە بوو کە زۆر حەزو ویست و توانای بۆی نەبوو ئەوا باوەڕی زیاتر کەم دەبێتەوە هەتا کەسێك کە ویست و توانا و ئارەزووی بۆی هەیە ، خۆ بەزل زانینی هەژارێك و زینا کردنی کەسێکی بەتەمەن تاوانەکەی گەورەترە لە خۆ بەزل زانینی دەوڵەمەندێك و زینا کردنی گەنجێك ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت : (( ثَلاثَـةٌ لا

---

[118] ( إغاثة اللهفان ) ( ٢ : ١٤٣ ، ١٤٤ ) باختصار ، و انظر : ( الجامع لشعب الإمان ) للبيهقي ( ٢ : ٧٨ و ما بعدها ) .

**يُكَلِّمُهُمُ اللهُ ، وَلا يَنْظُرُ إِلَيهِمْ يَوْمَ القِيَامَةِ ، وَلا يُزَكِّيهِمْ ، وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ ))** [١١٩] .
**وَذَكرَ مِنْهُم : (( الأُشَيْمِطُ الزَّانِي ، وَالعَائِلُ المُسْتَكْبِر ))** [١٢٠] .

**واته : (( سێ کۆمەڵ هەیە خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات و نە سەیریشیان دەکات و نە لەتاوانەکانیشیان خۆش دەبێت ، وە ئەشکەنجەیەکی بەئێشیان بۆ هەیە ، لەوانە : کەسێکی بەتەمەنی زیناکەری داوێن پیس و هەژارێکی لوت بەرز )) .**

**هۆکاری توندی ئەشکەنجەی ئەمانە لەبەر کەمی و نەمانی ئەو ئارەزووە و ویستەیە تیایاندا .**

**جا کورتەی ئەوەی کە ڕابوورد بێگومان تاوان باوەڕ کەم دەکاتەوە ، وە تاوان جیاوازە لە کەم کردنەوەی باوەڕدا بەگوێرەی چەند لێکدانەوەیەك لەوانە :**

**١ـ جۆری تاوانەکە .**

**٢ـ زۆری خراپەی .**

**٣ـ ئەندازەکەی .**

**٤ـ کات و شوێنەکەی .**

**٥ـ بەکەم زانینی .**

**٦ـ بەگوێرەی تاوان کارەکە .**

**لەسەر ئەوەی کە ڕابورد خوای گەورە تەوفیقمان بات .**

**وە ئەوەی کە مرۆڤەکان دەپارێزێت لەتاوان و کۆمەکی دەکات لەسەر دوور کەوتنەوە لە تاوان و کەوتنە ناوی : ناسینی سامناکی یەکەی و ئەوەشی لێوەی درووست دەبێت لە خراپی دوارۆژ و زەرەرەکانی .**

---

[١١٩] أخرجه الطبراني في ( الكبير ) ( ٢ : ٣٥١ ) ، و البيهقي في ( الشعب ) ( ٤ : ٢٢٠ ) .
قال الهيثمي في ( مجمع الزوائد ) ( ٤ : ٧٨ ) ( رجاله رجال الصحيح ) ، و أورده الشيخ الإمام محمد بن عبد الوهاب في كتاب ( التوحيد ) باب ما جاء في كثرة الحلف ، وقال ( رواه الطبراني بسند صحيح ) ، و صححه الألباني ، انظر ( صحيح الجامع ) ( ٣ : ٧٤ ) .
[١٢٠] ( فتح رب البرية ) ( ص : ٦٥ ) .

بۆیە پێشەوا ابن القیم ( ڕەحمەتە خوای لێبێت ) دەربارەی ئەم باسە وتەیەکی کورتی هەیە بەڵام پڕ مەبەستە کە دەفەرموێت : کەمی مۆفەقی و خراپی بۆچوون و نەمانی ڕاستی و خراپی دڵ و نەمانی باسکردن و لەدەستدانی کات و خۆپاراستنی خەڵکی لێی و نەمانی پەیوەندی نێوانی و خوای گەورە و ڕێگری قبوڵ بوونی دۆعا و ڕەق بوونی دڵ و نەمانی خێر و بەرەکەت لە ڕزق و تەمەن و بێ بەش بوونی زانست و پۆشینی کاڵای سەرشۆڕی و بەکەم زانین لە چاوی دوژمنەوە و تەسکی دەروون و تووشبوونی هاوەڵانی خراپی وەها کە دڵەکان خراپ دەکەن و کات بەدەستەوە نایەڵن و درێژی غەم و ناهەمواری و ناخۆشی ژیان و دەروونی غەمبار .... لە تاوان کردن و بێ ئاگایی لە زیکر و یادی خوای گەورەوە درووست دەبێت ، هەروەك چۆن کشتوکاڵ لە ئاوەوە دێتە بەرهەم ، وە سوتاندنیش لە ئاگرەوە درووست دەبێت ، وە پێچەوانەی ئەم ئاکار و سەرئەنجامە خراپانە بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە دێنە بەرهەم [١٢١] .

---

[١٢١] ( الفوائد ) ( ص : ٦٧ ) ، وانظر : ( الجواب الكافي ) لابن القيم ( ص : ٤٦ ) وما بعدها .

هۆكاری چوارەم :-

## دەروونی فەرمانكەر بە خراپە

دەروونی فەرمانكەر بە خراپە لە مرۆڤەكاندا هەیە ، كە فەرمانی پێ دەكات بە هەموو خراپەیەك و بانگیشی دەكات بۆ هەموو هۆكارێكی لەناوچوون و ڕێنمویی دەكات بۆ هەموو شتێكی پیس و بێزراو ، ئەوە سروشتیەتی و ڕوشت و ڕەفتاریتی ، جا ئەگەر تەوفیق و دامەزراوی و كۆمەكی پەروەردگار نەبوایە ئەوا هیچ كەسێك لە خراپەی نەفس و دەروونی دەرنەدەچوو ، هەروەك خوای گەورە قسەكەی خێزانی عەزیزی میصرمان بۆ دەگێڕێتەوە كە دەفەرموێت :﴿ ۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ ﴾ یوسف: ٥٣

واتە : هەرگیز پاكانە بۆخۆم ناكەم چونكە بێگومان هەمیشە نەفس و دەروون فەرمان بە خراپە دەكات مەگەر كەسێك كە خوای پەروەردگارم ڕەحمی پێكردبێت و لە فرت و فێڵی نەفسی پاراستبێتی بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێبوردەو میهرەبانە .

وە پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا ﴿٢١﴾ ﴾ النور: ٢١

واتە : ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوای پەروەردگار نەبوایە بەسەرتانەوە هیچ كەسێكتان لە گوناه و تاوان پاك نەدەبۆوە .

وە خوای گەورە بە خۆشەویسترین و بەڕێزترین بەندەی دەفەرموێت : ﴿ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الإسراء: ٧٤

واتە : خۆ ئەگەر خۆمان توند ڕامان نەگرتیتایەو دەستمان پێتەوە نەبوایە ، خەریك بوو لەخشتەت بەرن و تۆزێك بەلای ئەواندا مەیل بكەیت .

وە پێغەمبەری خوا ﷺ هـاوەڵانی ( ڕەزای خوایـان لێبێـت ) فێـری خطبـەی حاجـەی دەكردن بەم شێوازە : (( الْحَمْدُ للّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ ))[١٢٢] .

واتە : سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار سوپاسـی دەكـەین و داوای كۆمـەك و یارمەتی و لێبوردنی لێدەكەین و پەنای پێدەگرین لـە شەڕی ناخ و دەروغان و كردەوە خراپەكاغان ، هەر كەسێك خوای گەورە ڕێنویی بكات ئەوا كەس ناتوانێـت گـومڕای بكات وە هەركەسێكیش بەهۆی كاری ناپەسەندی خۆیەوە خوای گـەورە سـەری لـێ تێكبدات ئەوا كەس ناتوانێت ڕێنویی بكات .

جا شەڕ شاراوە و نادیارە لـە ناخ و دەروونـدا ، وە بانگخوازە بۆ ئەنجامدانی كـردەوەی ناپەسەند و ناشەرعی ، ئەگەر خوای گەورە بەندە باتە دەست نەفسی خۆی ئەوا بەنـدە لەناو دەچێت لـە نێوان نەفسی و ئەوانەی كە داوای دەكات لـە كـردەوەی ناشـرین و ناپەسەند ، خۆ ئەگەر خوای گەورە تەوفیق و كۆمـەكی بەنـدە بكـات ئـەوا لـەهـەموو ئەمانە دەربازی دەكات [١٢٣] .

وە بەڕاستی خوای پەروەردگار لـە بەرامبەر ئەم نەفسەدا نەفسی ئارام بە زیكر و یـادی خوای بە مرۆڤەكان بەخشیوە ، كاتێك نەفسە خراپەكە فەرمانی پێكرد بـە خراپـە ئـەوا نەفسە ئارامەكـە ڕێگـری لێـدەكات ، جـا جارێـك گوێڕایـەڵی ئەمیانـە و جـارێكیش گوێڕایـەڵی ئـەوی تریانـە ، وە زۆربـەی كـات ژیـانی ئاوایـە (( هـەركامیان بـەزۆری لەمرۆڤەكەدا هەبوو كەسەكە بەو شێوەیە دەبێت بەجۆرێك ئەگەر نەفسی ئەمارە زاڵبوو ئەوا پەنا بەخوا خراپ دەبێت بەڵام ئەگەر نەفسی ئارام و فەرمانكـەر بەچـاكە زاڵبـوو ئەوا كەسەكە چاك دەبێت - وەرگێڕ )) .

ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بێگومان خوای گـەورە لـە مرۆڤـدا دوو جۆر نەفسی دارشتووە ، نەفسی فەرمان كەر بە خراپە و نەفسی ئارام و لـەسەر خۆ

---

[١٢٢] أخرج هذه الخطبة : ( أبو داود ) ( ٢ : ٢٨٣ ) ، والنسائي ( ٣ : ١٠٥ ) ، و غيرهما ، وراجع رسالة الألباني ( خطبة الحاجة ) : فقد جمع فيها طرق و ألفاظ هذة الخطبة .

[١٢٣] انظر ( الروح ) لابن القيم ( ص : ٢٢٦ ) .

هەردووکیشیان دوو نەفسی دژبەیەکن ، هەر شتێك لەسەر یەکێکیان ئاسان بێت لەسەر ئەوی تریان نارەحەتە ، هەرچی شتێك یەکێکیان چێژی لێوەر بگرێت ئەوی تریان ئازاری پێ دەچێژێت ، هیچ شتێك لەسەر نەفسی فەرمان کەر بەخراپە نارەحەتتر نییە لەوەی کە کردەوە بکات بۆ خوای گەورە و ڕەزامەندی خوای گەورە بات بەسەر ئارەزوویدا ، وە هیچ شتێکیش لەوە بۆی بەسوود تر نییە ، وە هیچ شتێك بەئەندازەی ئەوە نارەحەت نیە بەسەر نەفسی ئارامەوە کە کردەوەیەك بکات بۆ غەیری خوای گەورە و شتێك جێ بەجێ بکات کە لە ئارەزوویەوە هاتبێت ، وە هیچ شتێك بەئەندازەی ئەوە بۆ زەرەر مەند نییە ... ئەم جەنگە بەردەوامە بە هەمیشەیی ، وە ئەم جەنگە تەواو نابێت هەتا مرۆڤەکان ئەجەلیان تەواو نەبێت و لە دونیا دەرنەچن [١٢٤] .

هیچ شتێك نییە لە نەفسی فەرمان کەر بە خراپە زەرەر مەندتر بێت لەسەر دین و باوەڕی مرۆڤەکان کە ئائەوە بار و دۆخ و وەصفی بێت ، نەفس هۆیەکی سەرەکییە ، وە ئەندامێکی کارکەرە بۆ لاواز کردن و جولاندن و بێ هێزکردنی باوەڕ .

وە لێرەدا پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە دەیەوێت باوەڕی بپارێزێت لە کەم بوون و لاواز بوون گوێ بدات بە سەر زەنشت کردن و ڕەخنە گرتن لەم جۆرە نەفسە ، وە زۆر لۆمەی بکات ، هەتا سەلامەت و پارێزراو بێت لە سەر ئەنجام و دوا ڕۆژی خراپ و ناهەموار .

وە لێ پرسینەوەی نەفس دوو جۆرە :

١- جۆرێك پێش کردەوە .

٢- وە جۆرێك دوای کردەوە .

جا جۆری یەکەم : ئەوەیە کە بوەستێت لە سەرەتای ویستیدا بۆ کارێك و پەلە نەکات ، هەتا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە بیکات یاخود نا .

وە جۆری دووەم : ئەوە لێ پرسینەوەی نەفسە دوای کردەوە .

---

[١٢٤] ( الجواب الكافي ) لابن القيم ( ص : ١٨٤، ١٨٥ ) .

ئەمیش سێ جۆرە :

یەکەم : لێ پرسینەوەی لەسەر کەم تەرخەمی کردنی لە بەندایەتی کردنی لە مافی خوای گەورەدا ، کە پێی هەڵ نەسابێت بەو شێوەیەی کە پێویستە .

دووەم : لێ پرسینەوە لەگەڵ نەفسی خۆیدا بکات لەسەر هەموو کردەوەیەك کە وازهێنانی چاکترە بۆی لە کردنی .

سێیەم : لە نەفسی بپرسێتەوە لەسەر هەموو کارێکی حەلاڵ یاخود کارێکی کە ئالوودەی بووبێت کە بۆچی کردویتی ؟ ئایە مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوای گەورە و ئاوەدان کردنەوەی قیامەتە ؟ جا وابێت ئەوا براوە و بە قازانجە ، یاخود مەبەستی بەو کارە ژیانی دنیایە ، گەر وابێت ئەوا ئەو خێر و قازانج و سەرکەوتنە لەدەست دەدات.

زەرەر مەندترین شت لەسەر بەندە : گوێ پێ نەدان و وازهێنان و جڵەو شلکردن و سارد و سڕییەتی لە کارەکانی نەفسیدا ، ئەم صیفاتانە دەیبات بەرەو لەناو چوون ، وە ئەمە حاڵی خەڵکانی گومڕا و لەناو چووە ، کە چاوی نوقاندووە لە دوا ڕۆژ دەڕوات و دەڵێ خوا لێم خۆش دەبێت ، وازی لە لێ پرسینەوە و ڕوانیین لە دوارِۆژی خۆی هێناوە ، جا کاتێك وای لێ هات تاوان کردن لەسەری ئاسان دەبێت و هۆگری دەبێت و وازهێنانیش گران و نارەحەت دەبێت .

ووتەی بەنرخ بۆ هەموو ئەمانە ئەوەیە :

یەکەم شت لە نەفسی بپرسێتەوە لەسەر کارە پێویست و فەرزەکان جا کە زانی کەم و کورتی هەیە ئەوا جێ بەجێی بکات یاخود خۆی چاك بکات .

پاشان لێی بپرسێتەوە لەسەر کارە قەدەغە کراوەکان ، ئەگەر زانی تاوانێکی ئەنجام داوە ئەوا لێی بگەڕێتەوە و داوای لێ خۆشبوون بکات و بەکاری چاکە بیسڕێتەوە .

پاشان لە نەفس و دەروونی بپرسێتەوە لەسەر بێ ئاگایی ، ئەگەر زانی بێ ئاگایە لەوەی کە ئەم لەبەری درووست کراوە ئەوا با یادی خوای گەورە بکات و ڕوو بکاتەوە خوای گەورە .

پاشان لێی بپرسێتەوە دەربارەی ئەوەی کە دەیڵێت یان کە بۆی دەڕوات یاخود دەستی بۆ دەبات و گوێکانی دەیبیستێت : کە مەبەستی پێی چییە ؟ وە لەبەر چی ئەمەی کردووە ؟ وە بۆ کردوێتی ؟ وە پێویستە بۆی کە بۆ هەموو جووڵە و ووتەیەك دادگایەك دابنێت : دادگایەك بۆ ئەوانەی کە کردوێتی بۆ کێی کردووە ؟ وە چۆن کردوێتی ؟ یەکەم پرسیارە دەربارەی نییەت پاکی ، وە دووەم پرسیارە دەربارەی شوێن کەوتن واتە ئەوەی کە کردوێتی وەك ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردووە .

جا کاتێك کە بەندە لێ پرسینەوەی لەگەڵدا دەکرا لەسەر هەموو شتێك ، لەسەر گوێ و چاوو دڵی ، ئەوە شایەنی باسە کە لێ پرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات پێش ئەوەی کە لێ پرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت ، وە بەڵگەش لەسەر بوونی لێ پرسینەوە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۝١٨ ﴾ الحشر: ١٨

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن بە هەستان بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان ، وەبا هەموو کەسێك سەرنج بدات و بزانێ چ شتێکی پێش خۆی خستووە بۆ بەیانی کە قیامەتە ؟

مەبەست لێرەدا : ئەوەیە کە چاك سازی دڵ بە لێ پرسینەوە دەبێت و خراپ بوونیشی بە گوێ پێ نەدانی و جڵەو شلکردن بۆی ، خوا یارمەتی دەرە وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ [١٢٥] .

وە پێشەوا ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ناخ و دەروون بانگخوازە بۆلای لەناوچوون ، یارمەتی دەرە بۆ دوژمن ، ڕوو دەکاتە هەموو بێزراو و ناپەسەندێك، شوێن هەموو خراپەیەك دەکەوێت ، وە بە سروشت و نەریتی خۆی دەڕوات بەرەو گۆڕەپانی سەرپێچی .

---

[١٢٥] انظر : ( إغاثة اللهفان ) لابن القيم ( ١ : ٩٧، ١٠٠ )

جا ئەو ناز و نیعمەتەی کە ترسناکی تیادا نییە : دەرچوونە لەچێر باری نەفس و خۆ دەرباز کردنە لە نەرمی و ناسکیەکەی ، ئەوە گەورەترین پەردەو بەربەستە لەنێوان بەندە و خوای پەروەردگاردا ، وە زانا ترین کەس بە نەفس و دەروون توندترینیانە لە بەرامبەری کردنی و ڕق لێ بوونی [126] .

داوالەخوای گەورە دەکەین کەپەنامان بدات لەخراپەی دەرونمان وە خراپەی کارو کردەوەکانمان چونکە بەڕاستی خوای گەورە بەخشندەو بەڕێزە .

[126] ( إغاثة اللهفان ) ( ١ : ١٠٣ ) .

بەشی دووەم :ـ

## هۆكارە دەرەكییەكان

هۆكارە دەرەكییەكان : بریتییە لە كاریگەریە دەرەكییەكان كە كار لە باوەڕ دەكەن بە كەم كردنەوە ، ئەویش هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ كاریگەری غەیری خۆی لەسەری بەكورتی ئەم باسەش لە سێ هۆكاردا كۆدەبێتەوە :

هۆكاری یەكەم :

## شەیتان

شەیتان بە یەكێك لە هۆكارە بەهێزەكان دادەنرێت لە هۆكارە دەرەكییەكان كە كار لە باوەڕ دەكات بە كەمكردنەوە ، شەیتان دوژمنێكی سەرسەختە بۆ باوەڕداران وە چاوەڕوانی بەلاَو نەهاتی بڕوادارانە ، هیچ غەم و پەژارە و ئامانجێكی نییە جگە لە لاواز كردن و و خراپ كردنی دڵی بڕواداران نەبێت ، جا هەر كەسێك تەسلیمی قەلەقی و ناهەمواری و وەسوەسەكانی شەیتان بێت و مل بۆ پلانەكانی كەچ بكات و پەنا بە خوای گەورە نەگرێت لێی ، ئەوا باوەڕی كەم و لاواز دەبێت ، بەڵكو هەندێ جار باوەڕی هەر نامێنێت ، بەگوێرەی وەلاَمدانەوەی مرۆڤی موسوڵمان بۆ گومان و پلانەكانی شەیتان .

هەر لەبەر ئەمەیە خوای گەورە بەتوندی ئاگادارمان دەكاتەوە لێی و ترسناكیەكەی و شوێن كەوتن و دوارۆژە خراپەكەیمان بۆ ڕوون دەكاتەوە ، چونكە دوژمنی بڕوادارانە ، وە فەرمانمان پێدەكات كە بە دوژمنی خۆمانی بزانین لەبەر ئەوەی لە خۆشی و گومان وەسوەسەكانیشی پارێزراو بین .

بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ ﴿٢١﴾ ﴾ النور: ٢١

واته : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بە شوێن نەخشەو هەنگاوەکانی شـەیتاندا مەڕۆن ، هەر کەسێك بەشوێن نەخشەو پلانـەکانی شـەیتاندا بـڕوات ئـەوە دووچـاری کاری ناپەسەند و ناشیاو دەبێت چـونکە بێگومـان هەمیـشە شـەیتان فـەرمان بـەکاری ناپەسەند و قێزەون دەکات .

وە دەفـــــەرموێت :﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر: ٦

واتە : بێگومان شەیتان دوژمنتانە دەسا ئێوەش ئـەو بـە دوژمـن بـزانن و ڕەفتارەکـانی مەکەن و پشت گوێی خەن ، چونکە بێگومان شەیتان گروپ و شوێن کەوتوانی خۆی بانگ دەکات بۆ ئەوەی پێکەوە ببنە یار و هاوەڵی ئاگری دۆزەخی گەرمی بڵێسەدار .

وە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ ﴾ یوسف: ٥

واتە : بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤەکان دوژمنێکی ڕوون و ئاشکرایە .

وە دەفـەرموێت : ﴿ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ المجادلة: ١٩

واتە : شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا بە وەسوەسەو پلانەکانی بۆیـە یـاد و نـاوی خـوای گەورەی لـەبیر بردوونەتەوە ئائەوانە دەستەو گروپی شەیتانن ، جا ئاگادار و هۆشیار بن چونکە بێگومان دەستە و گروپی شەیتان لـە دونیا و دوارۆژدا خەسـارە مەنـد و سـەر گەردانن .

ئیبن و جەوزی بەغدادی ( ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ) دەفـەرموێت : پێویـستە لـەسـەر کەسی ژیر کە وریا بێت لـەو دوژمنەی کە دوژمنایەتی خۆی دەرخست لـە سـەردەمی ئادەمەوە ﷺ ، وە هەموو تەمەن و نەفسی خۆی بەخشی بۆ خراپ کردنی بار و دۆخی نەوەی ئادەم ، وە خوای گەورەش فەرمان دەکات بە ئاگابوون و وریا بوون لێی .... ،

ئیبن و جەوزی بەغدادی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) چەند شتێك باس دەكات ، پاشان دەفەرموێت : وێنەی ئاگادار كردنەوە لە قورئاندا زۆرە [127] .

وە ئەبو موحەممەدی مەقدیسی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە پێشەكی كتێبەكەیدا كەناوی ( ذم الوسواس )ە دەفەرموێت : خوای گەورە شەیتانی كردووە بە دوژمن لە نەوەی ئادەم ، دادەنیشێت بۆی لەسەر ڕێگەی ڕاست و لە هەموو جێگە و ڕێگایەكەوە بۆی دێت هەروەك خوای گەورە هەواڵمان پێ دەدات دەربارەی قەسەكەی شەیتان كە وتویەتی : ﴿ لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَائِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف: ١٦ - ١٧

واتە : شەیتان بە عینادیەوە بە خوای گەورەی وت شەرت بێ لەسەر ڕێگەی تۆ بۆیان دابنیشم ﴿١٦﴾ ئەوساش لەبەردەم و لە دوایانەوە و لەلای ڕاست و چەپیانەوە بۆیان بچمو تووشی چەواشەكارییان بكەم ، ئەوسا دەبینیت كە زۆرینەیان سوپاس گوزار و یەكتا پەرست نابن .

وە خوای گەورە ئاگادارمان دەكاتەوە لە شوێن كەوتنی و فەرمانمان پێدەكات بە سەرپیچی كردن و دوژمنایەتی كردنی وەك دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر: ٦

واتە : بێگومان شەیتان دوژمنتانە دەسا ئێوەش ئەو بە دوژمن بزانن و ڕەفتارەكانی مەكەن و پشت گوێی خەن .

وە دەفەرموێت : ﴿ يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأعراف: ٢٧

واتە : ئەی نەوەكانی ئادەم وریا بن شەیتان فریوتان نەداو لە ئایینەكەتان وەرتان نەگێڕێت ، هەروەك باوك و دایكتانی بە فڕوفێڵ لەبەهەشت بەدەركردندا .

[127] ( تلبيس ابليس ) ( ص : ٢٣ ) .

خوای گەورە هەواڵمان پێدەدات کە چی کرد بەرامبەر باوك و دایکمان ، بۆ ئاگـادار کردنەوەمان لـە گوێڕایەڵی کردنی و نەمانی بەهانە بۆمان لـە شوێن کەوتنی ، وە خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات بەشوێن کەوتنی ڕێگای خۆی [128] .

جا شەیتان دوژمنی مرۆڤە ، غەم و پەژارەی خراپ کردن و وێران کردنی بیروباوەڕە ، جا هەر کەسێك نەفسی خۆی لێ نەپارێزێت بە زیکـر و یـادی خـوای گـەورە و پـەنا پێگرتن لێی و ئەوا دەبێت بە لـەوەڕگەی شەیتان ، تاوانی بۆ جوان دەکات و پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی قەدەغە کراوەکان و هانیشی دەدات بۆ کردنی کـاری خـراپ و قێزەون ، ئای شەیتان چ دین لـەناو بـەر و بـاوەڕ خـراپ کەرێکـە گـەر مرۆڤـەکان خۆیان بەن بەدەستەوە بۆی .

ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : ئامان ئاگادار بە کە شەیتان نیشتەجێ بکەیت لـەماڵی بیرو ویستەکاندا ، چونکە بە شێوەیەك خراپی دەکات کـە هـەرگیز بـە هۆشدا نەیەت ، جۆرەها گومـان و وەسوەسـەو بـیروڕای زەرەرمەنـدت دەداتـێ ، وە دەبێت بە بەربەست لـە نێوان تۆ و بیروڕایەکدا کە سوودت پێ ببەخشێت ، تـۆ خـۆت یارمەتیت دا بۆ نیشتە جێبوونی لـە دڵ و هەست بیروڕاتدا ئەویش لێـی داگـیر کردیـت بوو بەخاوەنی [129] .

وە وێنەیەکی جوانمان بۆ ئەم باسە بۆ دەهێنێتەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێـت ) ، کـە کـە پڕاوپڕ وەك خۆیەتی ، کە دەفـەرموێت لـە شـوێنێکی تـردا لـە کتێبەکانیـدا : کاتێـك وێنەیەکی هاو شێوەت ویست بۆ ئەم باسە ، وێنەی شەیتان وەك سـەگێکی زۆر برسـی وایە ، کە لـە نێوان تۆ ئەودا پارچە گۆشتێك یان پارچە نانێك هەیە ، وە دەبینێـت کـە تۆ ناتوانیت بەرامبـەری بوەسـتیت ، چـونکە لـەتۆ نـزیکترە لێـی ، وە تـۆش ڕێگـری لێدەکەیت و هاوار دەکەیت بەسەریدا ، ئەویش ئینکاری دەکات ئـەویش بـێ مانـدوو بوون لـەجەنگ دایە بەرامبەر بەتۆ و دەیەوێت بگاتە ئەوەی کەبە تۆیە [130] .

---

[128] ( ذم الوسواس ) ( ص : ٤٦ ) ، وانظر ـ أیضـا ـ مقدمة ابن القیم لکتابه : ( إغاثة اللهفان ) ( ١ : ١٠ ) .
[129] ( الفوائد ) ( ص : ٣٠٩ ) .
[130] ( التبیان في أقسام القرآن ) ( ص : ٤١٩ ) .

مەبەستی ابن القيم ( ڕەحمەتی خوای لیبێت ) بەم وێنەیە ئەوەیە کە ئەندازەی ساماناکی و ترسناکی شەیتان لەسەر مرۆڤەکان ڕوون بکاتەوە گەر پەنا بەخوای گەورە نەگرن و پەنای بۆ نەبەن بە زیکر و دۆعاو پاڕانەوە بەسوود و پیرۆزەکان لە شەڕو خراپەی .
جا هەر کەسێك پشت هەڵبکات لە خوای گەورە ئـەوە شـەیتان لەگەڵیـدا دەبێـت و هاوەڵی دەکات بەو شێوازە ، هەڵی دەنێت و فریوی دەدات هـەتا لـە بازنـەی بـاوەڕ دەری دەکات ، وە خوای گەورەش دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ ﴾ الزخـــرف: ٣٦ ـ ٣٨
واتە : هەر کەسێك لـە زیکر و یادی خوای گەورە پشت هەڵکات و ڕوو وەرگێرێت ، ئەوا ئێمەش شەیتانێکی بۆ دەسازێنین هەردەم هاوڕێی بێت و لێی جیا نەبێتـەوە ﴿٣٦﴾ وە ئەو شەیتانانە ڕێگەی ڕاستیان لێدەگرن و وایان لێدەکەن کەوا بزانن کـە بـۆ ڕێگـەی ڕاست ڕێنموونی کراون ﴿٣٧﴾ هەتا ئەو کاتەی کە خەڵاتاوەکە لەگەڵ هاوڕێکـەی لـە ڕۆژی دوایدا بۆ لیێ پرسینەوە دێتە لامان دەڵێت خۆزگە نێوان من و تـۆ بـە ئەنـدازەی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا دوور بووایە بەڕاستی هاوڕێیەکی زۆر خراپ بوویت﴿٣٨﴾.
خوای گەورە یارمەتی دەرە .

هۆكاری دووەم لە هۆكارە دەرەكییەكان :

## دنیا و ئالودە بوون بە فیتنەكانی

ئەمە دووەم كاریگەرییە لە كاریگەرییە دەرەكییەكانە كە كاریگەرە بۆ كەم كردنەوەی باوەڕی مرۆڤەكان بەڕاستی لە هۆكارەكانی كەم بوونەوە و لاواز بوونی باوەڕ خۆ خەریك كردن و خۆ ماندوو كردنە بە ژیانی دنیای تیاچووەوە بۆ بەدەست هێنانی و ڕۆشتن بەدوای خۆشی و فیتنە و كارە دڵگیرەكانی ، جا هەر كاتێك ویست و حەزی بەندە گەورە بوو بۆ ئەم شتانە و دڵی پێوە هەڵبەست ئەوا گوێڕایەڵی كردنی بۆ شەریعەت لاواز دەبێت و باوەڕیشی كەم دەكات بە ئەندازەی حەز و ویستەكەی .

ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بە ئەندازەی ویست و ڕەزامەندی بەندە بۆژیانی دنیا ئەوا گوێڕایەڵی كردنی بۆ خوای گەورە و هەوڵدانی بۆ دوارۆژ قورس و كەم دەبێتەوه [131] .

لەبەر ئەمەیە خوای خاوەن دانایی و ووردبین بە خراپی باسی دنیای كردووە لە قورئاندا و ئەندازەی بێنرخی و كەمیەكەیی باسكردووە لە چەندین ئایەتدا :

خوای گەورە دوفەرموێت : ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحدید: ٢٠

واتە : بەڕاستی بزانن كە ژیانی ئەم دنیایە تەنها گاڵتە و گەپ و جوانی و زۆركردنی ماڵ و منداڵ و خۆهەڵكێشانە لە نێوانتانا ، وێنەشی وەك وێنەی بارانێكی بەپیتە كە سەوزی و شینیەكەی جووتیاران سەرسام بكات هەروەك چۆن جوانیەكەی جووتیاران

[131] ( الفوائد ) ( ص : ١٨٠ ) .

سەرسام دەكات ئاواش بێ باوەڕانیش بە دونیا سەرسامن ، پاشـان زەرد هەڵگـەڕێت و ووردوخاش ببێت و بكەوێت ، وە لـە دوارۆژدا سزایەكی سەخت و نارەحەت هەیە بۆ بێ باوەڕان ، وە لێبووردن و ڕەزامەندیش هەیە بۆ باوەڕداران ، ژیانی دونیـا جگـە لـە خواناسی و دینداری ، تەنها كاڵایەكی دەسخەڕۆكارە ، كەوابوو هۆشیار و بە ئاگا بن .

وە دەفـــەرموێت : ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ ﴾ الكهــف: ٤٥ ـ ٤٦

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وێنەی ژیانی دونیایان بۆ بێنەرەوە كە وەك ئەو ئاوە وایە كە ئێمە لـە ئاسمانەوە دەیبارێنین جا تێكەڵ بە ڕووەك و سـەوزاوی و تـۆوی نـاو زەوی دەبێت هەموو جۆرە تەرزە و گژوگیایەكی هەمـە جـۆری پـێ سـەوز دەبێـت و زەوی دەڕازێننەوە ، كەچی لە پاش ماوەیەك هەمووی دەبێت بە پوش و پـەڵاش و بـا بـڵاوی دەكاتەوە ، وە هەمیشە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێكدا بەتواناو بە دەسـەڵاتە ﴿٤٥﴾ ماڵ و منداڵ و جوانی ژیانی دونیایە هـەق نییـە كـەس پێـی بخەڵـەتێ ، بـەڵام كـردەوە چاكەكان دەمێنێتەوە و چاكترە لای خوای پەروەردگار و باشترین هیوایە بۆ مرۆڤـەكان كە پاداشتی لەسەر وەربگرن ﴿٤٦﴾ .

وە خوای گەورە دەفـەرموێت : ﴿ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ ﴾ الرعد: ٢٦

واتە : كافر و بێ باوەڕەكان دڵخۆش و شادمان و لەخۆبایی بوون بە ژیانی دنیـا خـۆ ئەم ژیانی دنیایەش لەچاو دوارۆژدا لەزەت خۆشییەكی زۆر كورت و كەمە .

وه پــــهروهردگار دهفـــهرمويّت : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾﴾ يونس: ٧ - ٨

واته : بيّگومان ئهوانهى كه لهرِۆژى دوايدا ئوميّد و هيوايان بـه ديـدارى ئيّمـه نييـه و لهباتى دوارِۆژ به ژيانى دنيا رِازى بوون و ئارام و دلّنيان تيايداو پالّيان تيادا داوهتـهوه وه ئهوانهشى كه لـه ئايهت و نيشانهكانى ئيّمه بىّ ئاگان ﴿٧﴾ جىّ و رِيّى ئهوانـه هـهر هەموويان لـه دوارِۆژدا ئاگره بهبۆنهى ئهو كار و كردهوه ناپهسهندانهى كـه ئـهنجاميان داوه ﴿٨﴾ .

لـهم ئايهتانهدا گهورهترين ههرِهشه ههيه بۆ ئهو كهسانهى كه بـه ژيـانى دونيـا رِازيـن و ئارامن پيّى و لـه ئايهت و نيشانهكانى خواى گهوره بىّ ئاگـان و ئوميّـد و هيوايـان بـه دوارِۆژيان نهماوه .

وه خواى گهوره به بهدگۆيى و خراپه باسى ئهو برِوادارانه دهكـات كـه بـهژيانى دنيـا رِازين بۆيه دهفـهرمويّت : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾﴾ التوبة: ٣٨

واته : ئهى ئهو كهسانهى كه باوهرِتان هيّناوه ئهوه چيتانه كاتيّك كـه پيّتـان دهوتريّـت بچن بۆ جيهاد و كۆشش له پيّناوى خـواى گـهورهدا لـهشـگران و تهمـهلّن و خۆتـان دهنووسيّنن بهزهويدا ، ئايه بهژيانى دنيا رِازين لـهبرى دوارِۆژ ؟ ئهوا خۆشى و شـادى و گوزهرانى دنيا لـهچاو دوارِۆژدا زۆر كهم و بىّ هاوتايه .

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (( فَوَاللهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ ، وَلَكِنِّي أَخْشَى أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمْ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا ، وَتُلْهِيَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ )) [١٣٢] ، وَفِي لَفْظٍ لَهُمَا : ( تُلْهِيَكُمْ كَمَا أَلْهَتْهُمْ ) [١٣٣] .

واتە : (( سوێند بەخوا من لەهەژاری ناترسم کە بێت بەسەردانتا ، بەڵکو دەترسم کە خۆشی و فتنەی دنیا بکرێتەوە و برژێنرێت بەسەرتاندا هەروەك چۆن کرایەوە و رژێنرا بەسەر خەڵکانی پێش ئێوە ، وە ئێوەش پێش برکێی بۆ بکەن هەروەك چۆن ئەوان کردیان ، جا بە هیلاکتان بەرێت و لەناوتان بەرێت هەروەك وای بەسەر ئەوان هێنا )).

وە لە دەربرینێکی تردا هاتووە لای هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : سەرقاڵ و بێ ئاگاتان بکات هەروەك وای بە گەلانی پێش ئێوە کرد .

وە چەندین دەقی تر کە زۆر و بێ شومارن .

جا پێویستە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت باوەڕی بەهێز بێت نشەونما بکات و پێی خۆشە باوەڕی پارێزراو بێت لە کەم بوونەوە و لاوازی : ئەوا کۆششی نەفس و دەروونی خۆی بکات بە دوور کەوتنەوە لە دنیا و کارە دڵگیر و سەرقاڵیەکانی وە زیاتر لەوەش [١٣٤] .

جا کۆشش کردن بەرامبەر دنیاو وازهێنان لە سەرقاڵییەکانی نایەتەجێ دوای ڕوانین نەبێت لە دوو هۆ :

---

[١٣٢] البخاري ( ٦ : ٢٥٨ ، ٧ : ٣٢٠ ـ فتح ) ، م مسلم ( ٤ : ٢٢٧٤ ) من حديث عمرو بن عوف رضي الله عنه .

[١٣٣] البخاري ( ١١ : ٢٤٣ ـ فتح ) ، و مسلم ( ٤ : ٢٢٧٤ ) .

[١٣٤] بڕوانە ئەوەی کە ابن الجوزی نووسیویەتی لە کتێبی ( صيد الخاطر ) دا ( ص : ٢٥ ) و بەدواوە لە باسی ئەو شتانەی لە دونیادا زەم کراون و ئەو شتانەشی کە زەم نەکراون ، جا هەرچی خۆشی دنیا هەیە بە ئەندازەی خۆی خراپ و زەمکراو نییە بە ڕەهایی ، چونکە خوای گەورە منەتی کردووە لە قورئاندا بە ناز و نیعمەتەکانی لە چەند جێیەکدا ، بەس ئەوانەی کە زەمکراو و خراپن ئەوە ، کاری نەفامی و نەزانی و تاوان کردن خۆ خەریکردن بە دنیاو واز هێنان لە دوارۆژ و بەکار هێنانی ناز و نیعمەتەکانی دنیا لە غەیری ڕەزامەندی خوای گەورە .

یەکەم : ڕوانین لە دنیاو خێرایی نەمان و فەوتان و تێکشکان و کەمی و بێ نرخێکەی و ئێش و ژانی کێشمان کێشمان لەسەری و بەتەنگەوە چوونی و ئەوانەی کە لەم بابەتانەیە لە نارەحەتی و لێڵی و ئالۆزی و ناخۆشی .
وە کۆتایی ئەمەش نەمان و دابڕانە لەگەڵ دواییەیەکی پڕ لە ناخۆشی و خەفەتایی ، خوازیاری دنیا هەمیشە بێ پەژارە نییە پێش بەدەست گەشتنی دنیا و لەکاتی بەدەست گەشتنیشیدا و لەدوای لەدەست دانیشی .
دووەم : ڕوانین لە دوارۆژ و هاتنەکەی و بەرداوامی و مانەوەکەی و ئەو شکۆ و پلەوپایەیەی کە تیایدایە لە خێر و خۆشی و جۆرەها شتی دڵ خۆش کەر و جیاوازی هەموو جێگەو ڕێگاکانی بەو شێوەیەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعلى: ١٧
واتە : ژیانی دوارۆژ زۆر چاکتر و بەردەوام ترە بۆتان لەدنیا .
جادوا رۆژ خێرگەلێکی تەواوی بەردەوامی نەبڕاوەیە ، وەئەم دونیایە کۆمەڵە خەیالێکی ناتەواو بچڕاوو تێکشاکاوو پوکاوەن .
جا کاتێك نەوەی ئادەم بیریکردەوە لەم دوو هۆیە و بەجوانی لێی ڕوانین ، ئەوا ڕێنمویی دەکات بۆ فەزڵدانی دوارۆژ نەبڕاوە بەسەر دنیای بڕاوە ، وە گەورەترین کۆمەکیش بۆ هاتنە جێی ئەمە ڕوانینە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ( ڕەزای خوایان لێبێت ) لە فرێیانی دنیا بۆ پشتیان و ڕوو وەرچەرخانی دڵیان لێی و دوور کەوتنەوەیان و ئالوودە نەبوونیان پێوەی و وازهێنان و مەیل نەدانیان بۆی ، وەژیانی دونیایان بە بەندینخانە داناوە نەك بەبەهەشت ، بۆیە بە ڕاستی وازیان لێ هێنا خۆ ئەگەر بیان ویستایە تیایدا دەستیان بە هەموو خۆشییەك دەگەشت و دەگەشتن بە هەموو خواستراوێك ، بێگومان هەرچی کلیلی گەنجینەکانی دنیا هەیە درا بە پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە و نەیویست ، وە دنیا ڕژا بەسەر هاوەڵانیدا ( ڕەزای خوایان لێبێت ) ئەوانیش بەخشیان و دوارۆژی خوایان لەبەرامبەریدا نەفرۆشت ، چونکە زانیان دنیا ڕێچکە و

ڕێڕەوی پەڕینەوەیە جێگەی مانەوە و حەوانەوە نییە ، بەڵکوماڵی پەڕینەوەیە نەك ماڵی کامەرانی ، وە زانیان کە دنیا هەوری هاوینە و زوو دەڕەوێتەوە و خەوێکی خەیاڵاویەو دەڕەوێتەوە هەتا کاتی مردن و بەجێ هێشتنی دنیا [١٣٥] .

هەروەك خوای گەورەش دەفەرموێت : ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ الشعراء: ٢٠٥ - ٢٠٧

واتە : باشەئەگەر ساڵەهای ساڵ بیان ژێنین و موڵەتیان بەینێ ئایە باوەڕ دەهێنن ﴿٢٠٥﴾ لە پاشان ئەو هەڕەشەو بەڵێنەی کە پێیان دراوە هەر بێتە لایان ﴿٢٠٦﴾ ئەو خۆشگوزەرانی و تەمەن درێژییە هیچ سوودێکیان پێ نابەخشێت جا ئیتر بۆ مۆڵەت بدرێن ﴿٢٠٧﴾ .

وە خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴿٤٥﴾ ﴾ یونس: ٤٥

واتە : یادی ئەو ڕۆژە بکە کە خوای گەورە هەموو بێ باوەڕ و کافرەکان کۆدەکاتەوە بۆ وەرگرتنی تۆڵەی کارەکانیان ئەو ڕۆژە وادەزانن تەنیا ساتێك لـە دنیـادا ماونەتـەوە لەبەر سەختی و دژوارێکەی ، وە یەکتریش دەناسنەوە و بەر دەبنە گلەیی وگازندە لـە یەکتری ئەم بەو دەڵێ من بەبۆنەی تۆوە وام لێهات و ئەم بـەو دەڵـێ تـاوانی تـۆ وای لەمن کرد .

وە دەفـــەرموێت : ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ ﴿٥٥﴾ ﴾ الروم: ٥٥

واتە : ڕۆژێك کە قیامەت بەرپا دەبێت کافران و بێ باوەڕان سوێن دەخۆن کـە بـەدەر لە سەعاتێك نەبێت لە دنیادا نەماونەتەوە .

وە چەندین دەقی ئایەتی تر .

---

[١٣٥] انظر ( الفوائد ) لابن القيم ( ص : ١٧٦ ، ١٧٨ ) .

داوا لە پەروەردگار دەکەین کە دڵەکانمان ئاوداشت بکات بە باوەڕ و بمان پارێزێت لە فیتنە دیار و پەناهەنەکانی دنیا .

هۆكاری سێیەم :ـ

## هاوەڵانی خراپ

ئـەوان زەرەر مەنـدترین كەسـن لەسـەر بیر و بـاوەڕ و هەڵـسووكەوت و ڕەوشـتی مرۆڤەكان ، تێكەڵ بوون و هاوەڵی كردنیان هۆیەكی گەورەیە بۆ كەم بوونەوە و لاواز بوونی باوەڕ .

لەم بارەیەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی : (( الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ )) [١٣٦] .

واتە : پیاو لەسەر دین و ئاینی هاوڕێ و هاوەڵەكەیەتی ، جا هـەر یـەكێك لـە ئێـوە بڕوانێت كە هاوڕێیەتی و هاوەڵی كێ دەكات .

وە ابن عبد البر ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : واتـای ئـەم فەرموودەیـە كـە خوای گەورەش زاناترە : ئەوەیە كە بەڕاستی مرۆڤەكان ئالوودە دەبن لەو كردەوانەی كە لە هاوەڵەكانی دەیبینێت ، چونكە دین نەریت و ئالوودە بوونە ، هەر لەبەر ئەمەیە كە فەرمان بە نەوەی ئادەم كراوە تەنها هـاوەڵی كەسـانێك بكـات كـە كـاری شـیاو جوانیان تیادا ببینێت ، چونكە بێگومان چاكترین ئالوودە بوون ئالوودە بوونی دینە .

هەر لەمانای ئەم فەرموودەیەدایە ئەم شیعرەی عەدی كوڕی زەید :

عَنِ الْمَرْءِ لا تَسْأَلْ وَ سَلْ عَنْ قَرِينهِ      فَكُلُّ قَرِينٍ بِالْمُقَارِنِ مُقْتَدِي

واتە : پرسیار مەكە دەربارەی مرۆڤەكان بەڵكو بپرسە دەربارەی هاوەڵی چونكە هەموو كەسێك چاو لە هاوەڵەكەی دەكات.

وە ئەم شیعرەی ئەبی عەتاهیە :

مَنْ ذَا الَّذِي يَخْفَى عَلَيكَ      إذا نَظَرْتَ إلى خَدِينِهْ

واتە : كێ لە تۆ شاراوەیە      كاتێك ڕوانیتە هاوەڵەكەی .

---

[١٣٦] أخرجه أبو داود ( ١٣ : ١٧٩ ـ عون )، والترمذي ( ٤ : ٥٨٩ )، و أحمد ( ٢ : ٢٠٣ )، و عبد بن حميد في ( المنتخب من المسند ) ( ص : ٤١٨ )، و الحاكم ( ٤ : ١٧١ )، وهو حديث حسن ، كما في ( السلسلة الصحيحة ) للألباني(٢:٦٤٣).

وێنەی ئەم نموونانە زۆرە .
واتای ئەمە ئەوەیە : کە ئینسان تێکەڵی کەسێك نەکات هەڵی نیت بۆ کارێك و ڕێگایەك کە چاك و سوپاس کراو نەبێت ، بەڵام کەسێك ترسی ئەمانەی نەبێت خراپە نییە لە هاوڕێیەتی کردنی [137] .
وە ئەبو سولەیمانی خەطابی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : (( پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی )) واتە : هاوەڵی کەسێك مەکە کە لە ئاین و سپاردەی ڕازی نەبیت ، چونکە کە هاوڕێی کەسی وات کرد ئەوا دەتبات بەرەو دین و ڕێگاکەی گومڕایی و ساویلکەیی نەت گرێت بە دینەکەتەوە و سەرکەشی بکەیت بە نەفسی خۆت هاوڕێی کەسێك بکەیت کە دین و ڕێبازی جێی ڕەزامەندی نەبێت .
سوفیانی کوڕی عوەینەش ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : گێڕراوەتەوە دەربارەی ئەم فەرموودەیە کە وتراوە : بڕوانن لە فیرعەون هامانی لەگەڵدا بوو ، وە بڕوانن لە حەجاج یەزیدی کوڕی ئەبی موسلیم لەگەڵدا بوو کە لەخۆی خراپتر بوو وە بڕوانن بۆ سولەیمانی کوڕی عەبدول مەلیك ڕەجائی کوڕی حەیوە هاوڕێی کرد بەهێزی کرد و ڕێی ڕاستی پیشاندا .
وە وتراوە : هاوڕێیەتی وەرگیراوە لە خۆشەویستی دڵ و جێنشینکردنی تیایدا ، ئەویش بەرزترین پلەی برایەتییە ، خۆ خەڵکیش لە بنچینە و بناغەدا بێگانە بوون بەیەك ، کاتێك یەکتریان ناسی خولقەتی یەکیان گرتوو ئالوودەی یەکتر بوون و بوون بە خۆشەویستی یەکتری ، وە کاتێك کە تێکەڵی یەکتری بوون ئەوا خۆشەویستی یەکترین کاتێك خۆشەویستێکە چەسپاو و زیاد بوو دەبێت بە هاوڕێی [138] .
وە وتراوە : خەڵکی وەك پۆلی کوڕ کوڕ وان . کە جۆرە باڵندەیەکە ـ لەوەی کە درووست کراون لەسەری لە هاوشێوەیی هەندێکیان لە هەندێکی تریان و دووبارە

---

[137] ( بهجة المجالس ) ( ٢ : ٧٥١ ) .
[138] ( العزلة ) ( ص : ٥٦ ) .

کردنەوەی کردەوەی هەندێکیان لەلایەن هەندێکی تریانەوە ، هەر لەبەر ئەمەیە کەسێك کە چاکەیەك دەکات یاخود خراپەیەك ئەوا پاداشتی بەئەندازەی ئەو کەسە هەیە کە کارەکەی دووبارە دەکاتەوە جا چ چاکە بێت یان خراپە [١٣٩] .

وە هەندێك لە داناکان وتیانە : کۆڵەکەی خۆشەویستی تێکەڵ بوونە ، وە هەموو خۆشەویستیەك بەبێ تێکەڵ بوون زوو لەناو دەچێت و نامێنێت [١٤٠] .

بۆچی رێگری کردن هاتووە دەربارەی تێکەڵ بوون و دانیشتنی هاورێ و هاوەڵی خراپ چونکە سروشتی مرۆڤەکان دروستکراوە لەسەر شوێن کەوتن و چاو لێکردنی ئەوەی کە هاوەڵی دەکات ، جا دانیشتن لەگەڵ کەسانێك کە خەریکی خوێندن بن ناخ و دەروون دەجولێنێت و هانی دەدات بۆ خوێندن ، وە دانیشتن لەگەڵ خواناسان و دنیا نەویستان وا لە مرۆڤەکان دەکات کە خواناس و دنیا نەویست بن ، وە دانیشتن لەگەڵ ئارەزوو بازان و بیدعە چییان مرۆڤەکان دەخاتە ناو بیدعە و خۆرافاتەوە ، وە دانیشتن لەگەڵ دنیا ویستان دەروون دەجولێنێت بۆ بەتەنگەوە هاتن و ویستنی دنیا وە هەروەها سەرجەم شتەکانی تریش .

لەبەر ئەمەیە پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە هاوەڵ و هاورێیەك هەڵبژێرێت لە هاوەڵیاندا تووشی سوود و خێر ببێت ، وە زۆر بەئاگا بێت لە هاوەڵی و تێکەڵی خەڵکی خراپ .

وە هەر کەسێك بیربکاتەوە لە ژیان و بارودۆخی پێشینە چاکەکان ئەمە دەزانێت ، وە توندی بەئاگاییان دەبینێت لە هاوەڵی خراپ هەر لە بەد ڕەوشتەکان و بیدعە چییەکان و جۆرەکانی تریش لە خەڵکی خراپ [١٤١] .

ئەبو دەرداء ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرموێت : لە ووردی و تێگەشتویی پیاو ئەوەیە کە جێی هاتوو چۆو ڕۆشتن و هاتن و دۆستایەتی خۆی بزانێت .

---

[١٣٩] انظر : ( الإستقامة ) لابن تيمية ( ٢ : ٢٥٥ ) .

[١٤٠] ( العزلة ) للخطابي ( ص : ٦٢ ) .

[١٤١] انظر في ذلك على سبيل المثال ( العزلة ) للخطابي ( ص : ٥٦ ) وما بعدها ، و ( الإبانة ) لابن بطة ( ٢ : ٤٣١ ) وما بعدها ، و غيرهما .

وە ئەبو قیلابە دوای ئەوەی کە ئەم وتەیە لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕێتەوە دەفـەرموێت :
ئایە نارِوانی بۆ وتەی ئەم شاعیرە کە دەفەرموێت :

عَنِ المَرْءِ لا تَسْأَلْ وَأَبْصِرْ قَرِينَهُ     فَإِنَّ القَرِينَ بِالْمُقَارِنِ يَقْتَدِي [١٤٢]

واتە : پرسیار دەربارەی خەڵك مەکە بەڵکو لە هاورِێکەی بروانە
چونکە هاورِێ شوێن هاورِێکەی دەکەوێت

وە ئەصمەعی (رِەحمەتی خـوای لێبێـت ) دەربـارەی ئـەم شـیعرە دەفـەرموێت : هـیچ شیعرێکم نەدیوە بەئەندازەی ئەم شیعرە لە سوونەت بچێت [١٤٣] .

وە لە عەبدوڵڵای کورِی مەسعودەوە هاتووە ( رِەزای خوای لێبێت ) کە فەرموویەتی : خەڵکی هەڵسەنگێنن بە هاورِێکانیان چونکە ئینسان هاورِێی کەسێك دەکات کـە پێـی سەرسام بێت .

وە ئەعمەش (رِەحمەتی خـوای لێبێـت ) دەفـەرموێت : هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ رِەزای خوایان لێبێت : پرسیاریان دەربارەی کەس نەدەکرد دوای سێ شت : رِێگەی رِۆشتن و هاتن و هاوەڵی و دۆستایەتی کردنی نەبێت لەگەڵ خەڵکدا .

وە سوفیان (رِەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : هیچ شتێك نییە لەپێـشتر بێـت لـە هاوەڵ و هاورِێ بۆ چاکی و خراپی نەوەی ئادەم .

وە قەتادە (رِەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : سوێند بەخوا ئێمە هـیچ کەسـێکمان نەدەبینی هاوەڵی هیچ کەسێك بکات جگە لە هاو وێنەی خۆی نـەبێت ، جـا هـاوەڵی پیاو چاکان بکەن لە بەندەکانی خوای گەورە ، بەڵکو لەگەڵێنابن یان هاو وێنەیان بن .

وە فوضەیل (رِەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت : بۆ باوەرِدار نییە بەئارەزووی خۆی هاوەڵی چ کەسێکی بوێت بیکات [١٤٤] .

---

[١٤٢] رواه ابن الأعرابي في ( معجمه ) برقم ( ١٢٧٧ )، ومن طريقه الخطابي في ( العزلة ) ( ص : ٥٩ )، و رواه ابن بطة في ( الإبانة ) ( ٢ : ٤٣٧ ، ٤٣٩ ) بلفظ مقارب .
[١٤٣] ( الإبانة ) لابن بطة ( ٢ : ٤٤٠ ) .
[١٤٤] روى هذه الآثار ابن بطة في ( الإبانة ) ( ٢ : ٤٣٩، ٤٥٢، ٤٧٦، ٤٨٠، ٤٨١ ).

وته دەربارەی ئەم باسە لە سەلەفەوە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت ) زۆرە باسکردنیان زۆری دەوێت ، بۆیە ئەوەی کە بۆم پاڵفتە کردن لێیان کافیە .
جا هەر کەسێك بیر بکاتەوە لەو وتانە و غەیری ئەوانەش کە باسمان کرد بەراوردی خەڵکی خراپ دەزانێت کە چی ترسناکییەکی هەیە لەسەر ئاین و ڕەوشت ، تۆ پیاوێك دەبینیت ڕاست و چاك و داوێن پاك ، کاتێك هاوەڵی و تێکەڵی خەڵی خراپ و خراپە کاری کرد ئەویش وەك ئەوانی لیٚ دێت ، ئەوە ڕێگای خوای گەورەیە لە درووست کراوەکانیدا ، وە هەروەك وتراوە : هاوڕیٚ و هاوەڵ ڕاکێشەرەوە . ( واتە : گەر چاك بێت ئەوا بەلای چاکە ڕاکێشەرە گەر خراپیش بێت بە پێچەوانەوە : وەرگێڕ ) .
لەسەر ئەمانەی کە باسمان کرد تێکەڵی خەڵکی خراپ و تاوان کار لە گەورەترین هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ و لاواز بونێتی ، بەڵکو هەنیٚ جار هۆکاری تێکشکان و لەدەست دانێتی ، ئەویش بەگوێرەی خراپی ئەو کۆمەڵەیە کە هاوەڵییان دەکات و بە گوێرەی تێکەڵ بوونیانە .
وە لەوەی کە زۆر بووە لە سەردەمی ئێمەدا و هاتۆتە ژێر یاسای هاوەڵییەوە بەڵکو زیاتر لە هاوەڵیش ، دانیشتنە بەدیار کەناڵە ئاسمانیەکان و سەرچاوە تێکدەر و لارولوێرەکانە لە ئینتەرنێت ، بەشێوەیەك دوژمنانی دین لەوێوە داخڵی ناو خەڵکە داماو و ماڵەکان بوون ، زەهر و فیتنەی خۆیان هەڵدەگرن لەگەڵ بێنرخی و کەمی و خراپەی خۆیاندا بلاٚوی دەکەنەوە ، ئەوانە لەپێشدا بیٚ توانا بوون لە گەشتن بە بیروبۆچوون و هۆشی گەنج و لاوە تازە پێگەشتووەکان .
بەڕاستی ئەوەی جێی داخە : کە کوڕ و کچانی موسوڵمانان دانیشن بە دیار ئەو شاشە لەناوبەر و تێکشکێنەرانە چەندین سەعات ، بەجوانی گوێیان بۆ بگرێت و سەیریان بکات و ئەوەیشی بۆ باس دەکەن بەدڵ وەری بگرێت ، لەگەڵ ڕۆشتنی زەمان و سەردەمدا بیر و بۆچوونە پیسەکان دزە دەکاتە ناومان و شەڕ و خراپەش زیاد دەکات .
جا ئەوەی کە پێویستە لەسەر موسوڵمان : ئەویە کە ناخ و دەروون و ماڵەکەی بپارێزێت لەو ویستە تێکدەر و ڕێگا شەڕو خراپانە ، ئەم کارە لە کۆتای سامناکی و

ترسناکیدایە ، پارێزەریش تەنها خوای گەورەیە ، وە هەر کەسێکیش دەست بگرێت بە بەرنامەی خوای گەورەوە ئەوە ڕێنوویی کراوە بۆ ڕێگای ڕاست .

اللَّهمَ أَصْلِحْ لَنَا دِينَنَا هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِنَا ، وَأَصْلِحْ لَنَا دُنْيَانَا التي فيهَا مَعَاشُنَا ، وأَصْلِحْ لَنَا آخِرَتَنَا التي فيهَا مَعَادُنَا ، وَإجْعَلْ الحَيَاةَ زِيَادَةً لَنَا في كُلِّ خَيْر ، وَالَموتَ رَاحَةً لَنَا مِنْ كُلِّ شَرّ .

لە کۆتایدا :ـ

ئەمە چەند دێڕێکی پیرۆزە لە هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ و کەم بوونەوەی ، کۆمکردۆتەوە بۆت برای خۆشەویستم ، لە چەند جێگاو سەرچاوەی جیاواز ، بۆ چاو ڕۆشنی و وریایی .

داوای مۆفەقی و دامەزراوی لە خوای گەورە دەکەم بۆ هەموو لایەك .

وآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ ، وَ صَلَّى اللهُ وَ سَلَّمَ وَبَارَكَ وَأَنْعَمَ على عَبْدِهِ وَرَسُولِهِ نَبينا مُحَمَّد وَعلى آلهِ وَ صَحْبِهِ أَجْمَعِينَ .

## ﴿ پێرست ﴾


| ژ | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١. | پێشەکی وەرگێڕ | ٥ |
| ٢. | **پێشەکی دانەر بۆ چاپی یەکەم** | ٧ |
| ٣. | هۆکارەکانی زیاد بوونی باوەڕ | ١٢ |
| ٤. | هۆکاری یەکەم : فێربوونی زانستی بەسوود | ١٣ |
| ٥. | خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و بیرلێکردنەوەی | ٢٨ |
| ٦. | ناسینی ناوەجوانەکانی خوای گەورەو صیفاتە بەرزەکانی | ٤٥ |
| ٧. | بیرکردنەوە لە ژیانی پێغەمبەری بەڕێز ﷺ | ٥٥ |
| ٨. | بیرکردنەوە لە جوانییەکانی ئاینی ئیسلام | ٦٤ |
| ٩. | خوێندنەوەی ژیانی پێشینەی ئەم ئومەتە | ٦٨ |
| ١٠. | هۆکاری دووەم : بیرکردنەوە لە نیشانە گەردونیەکانی پەروەردگار | ٧٢ |
| ١١. | هۆکاری سێیەم : کۆششکردن لە کردەوە چاکەکاندا | ٨٢ |
| ١٢. | هۆکارەکانی کەم بوونەوەی باوەڕ | ١٠٥ |
| ١٣. | هۆکارە ناوەکییەکان | ١١٠ |
| ١٤. | هۆکاری یەکەم : نەفامی کە دژی زانستە | ١١٠ |
| ١٥. | هۆکاری دووەم : بێ ئاگایی و پشت هەڵکردن و بیرچوونەوە | ١١٧ |
| ١٦. | هرکاری سێیەم :لاساری کردن و ئەنجامدانی تاوان | ١٢٣ |
| ١٧. | هۆکاری چوارەم : دەروونی فەرمانکەر بە خراپە | ١٣٢ |
| ١٨. | هۆکارە دەرەکییەکان | ١٣٨ |
| ١٩. | یەکەم : شەیتان | ١٣٨ |
| ٢٠. | دووەم : دنیا و ئالودە بوون بە فیتنەکانی | ١٤٣ |

هۆکارەکانی زیاد بوونو کەم بوونی باوەڕ، چەندین سوودو قازانجی زۆر و چڕو پڕی هەیە، بەڵکو پێویستی زۆرە بۆ ناسینیان و بایەخ پێدانیانو شارەزابوونیانو ناساندنیان، چونکە باوەڕ بەڕاستی تەواویەتی بەندەیەو ڕێگەی نەجاتو سەرفرازییەتی، هەر بە باوەڕ پلەوپایەی لە دونیاو دوارۆژدا بەرز دەبێتەوەو هۆکارو ڕێگەی هەموو چاکەیەکە لە ئێستاو داهاتووشدا، بۆیە باوەڕ نەدەست دەکەوێتو نە بەهێزو پتەوو تەواو دەبێت، تەنها بە ناسینی ڕێگاو هۆکارەکانی نەبێت.

